# النفاق بە کوردی

## زنجیرەیەک لە کردەوەکانی دڵ

نوسینی :

**الشیخ محمد صالح المنجد**

وەرگێرانی :

**قاسم محسن عولا**

1444 هـ        2023 م

## پیشەکی :

**ا لحمد الله رب العالمين ، والصلاه والسلام على نبينا ﷺ وعلى آله وصحبه أجمعين . أما بعد :**

بی گومان دوو روویی نەخۆشیەکی زەرداوە ، دەرچوونیکی ترسناکە ، وە شەرانگیزیەکی بەردەوامە ، ئەوە لە ترسانکترین نەخۆشیە کانە دل خراپ دەکات ، چونکە ئەگەر مەترسیدار ترینیان نەبێت ، وە ك مرۆڤە کە خۆی بی گومان بەدوو رووی خۆی رازی نیە ، بەلان لەوانیە بکەویتە ناویەوە و کە خۆی هەستی پیناکات ، وە بە تایبەتی دوو رووی کردەوەیی یان پراکتیکی ، وە ئەوە مانای وانیە کە مرۆڤ بوەستی لە بی توانی رووبەرووی بیتەوە ، وە ئەوەی بە کەمی دەزانیت بە هەلە خۆی بە هیز دەکات ،چونکە دوو رووی هەموو سیفەتیکی باش لە مرۆڤ دەسینیتەوە ، وە بی گومان دوو رووی ریگری دەکات لە ئە نجامدانی هەموو کارە چاکە کان ، وە دادە مالنریت لە هەموو بە هایەکی مرۆڤایەتی ، تە نانەت دەبیتە کەسیکی دەرکراو شکست خواردوو دوورخەرەوە لە هەموو بەها مرۆڤایەتیە کان ، وە لە قورئانی پیرۆز دا زۆر ئایەت هاتوو تەخوارەوە دەربارەی خەلکانی دوور روو بە جوانی بۆمانی روون کردۆتەوە وە ئاشکرایی کردوون ، وە باسی سیفەتەکانی نفاق دوو رووی کردوون ، وە بی گومان لە کتابە دا باسی سیفاتەکانی دوو روو دەکەین ، وە پیناسەی دوو روو باس دە کەیت ، هەروەها باسی جۆرە کانی نیفاق یان دوور وو دەکەین ، وە ریچەکانی مرۆڤی دوو روو باس دە کەین ، وە ریگاکانی ریگری کردن لی یان ریگا کانی خۆ پاراستن لە نفاق یان دوو رووی کردن لە گەل خەلکیدا ..!! بی گومان دوورروو یی کاریکی زۆر نا مرۆڤانەیە لە هەر کەسیك بەدی بکریت ، چونکە دوورە لە هەموو بە ها مرۆڤایەتیە کان ، بی دوو رووی لە کردەوە کانی دل دە روون ئەو کەسەی کە دوو روو ە بی گومان دل دەرونی نەخۆشە ،ختمی رەشەی لە سەر دلی دلیدراوە بۆ هەمیشە ، تەنها خوای گەورە زانایە بە دل دەرونی هەموو کەسیك هەر بۆیە بۆمانی باس دەکات لە قورە ئانە پیرۆزە کەیدا ، چونکە دوو روو ،هەمیشە درۆزنە بەردە وام درۆیی لە سەر زاریە بۆ خەلك درۆ دەکات ، روویکی ئاشکرایی هەیە کە بۆ خەلك کاری جوان دەکات تاکو خەلك باوەر بکەن ، بە لە ناوەوە لە دل پیس و بۆگەنە نەخۆشەکەی دا قیزەوەنترین کار ئە نجامدەدات ، بەلی دوو روو هەمیشە بی پە یمان و بی وە عدە ، هەمیشە زۆلم ستەم دەکات لە گەل خەلك دا ، بۆ هەمیشە بەردوام خیانەت و ناپاکی دەکات ، هەر بۆیە نەخۆشیە کی زۆر کوشندەی دل دەروونە ..!!

# پیناسەی ( النفاق )

## ووشەی ( النفاق ) رووی زمانەوانیەوە :

ووشەی ( نفق ) لە پیتی ( نون ) و ( فا ) و( قا ) پیك كاتووە ،لە بنەرەتدا پتی رە سەنن ، هەر یەكیكیان ئاماژەیە بۆ پچراندنی شتیكی رۆیشتووە ،وە ئەوەی كۆتایش بۆ شاردنەوەی شتیك یان وون بوون ..!!

( نفق ) واتا : لە توونیلە وە وەر گیراوە ، یان لە ناخی زەویەوە رواوە ، كە تیدیدا خۆی دە شاریتەوە ، وە ناوی ( النفاق ) یان دوو رووی لینراوە ، هەر بۆیە چۆنكە بی باوەرە كەی خۆی دە شاریتەوە یان كفرە كەی خۆی دەشاریتەوە .[1]

## ووشەی ( النفاق ) لەرووی زاراوەی شەرعیەوە :

ووشەی ( نفاق ) یان دوو رووی پیناسەیەكی تەواو ی نیە لە لایەن عەرب ، كە بە مانایەكی تایبەتی هە بیت ، بەلكو لە بنچینە دا لە ووشەیكی رەسەنی زمانی عەربیە ..!!

ووشەی ( نفاق ) واتا : ئاشكرا كردنی چاكە ، وە شاردنەوەی خراپە ..!!

وە لە ( ابن جریج ) وەرگیراوە ، دەلیت : ( نفاق یان دوو روو ) پیچەوانەی ( كردەوە ووتەیە ) ،( ئاشكراو نهینیە )، ( چوونە ژوورە و دەرچوونە ) ، ( دیارو نادیارە ) یان ( دیمەن و سەیر كردنە ).[2]

[1] -بروانە : للسانالعرب (٣٥٧/١٠) ، و معجم مقایس اللغة (٤٥٥/٥).
[2] - ابن كثیر في تفسیر القران العظیم (١٧٦/١).

## جۆره كانی (النفاق ) 

### نفاق : دابەش دەبیت بە سەر دوو جۆر دا :

أ نفاق الاكبر واته : دوو رووی گەوره ب نفاق أصغر واته : دوو رووی بچووك 

(أبن تیمیه ) - رحمەتی خوای لی بیت – دە لیت : (دوو رووی وەك بی باوەری وایە ، بە واتای دوو روویی بی دوو روویی وە ئەمە زۆر جار دە ووتریت : بی باوەریەك كە مرۆڤ لە ئاینی ئیسلام پی دەربچیت ،یان بی باوەریەك كە لە ئاینی ئیسلام دەر نەچیت ، یان دوو رووی گەوره یان دووری بچووك ) ..!! .[3]

أنفاق الاعتقادی او ( نفاق الاكبر)واته : دوو رووی باوەری یان دوو رووی گەوره :

چونكه لە بنچینەدا مرۆڤە كە خۆی بە ئاشكرا ئیمان ئیسلامی هەیە ، بەلام بی باوەره لە ناخی دا خۆی شاردۆتەوه لەناخی دا كافره ،وە ئەم دوو روویه لە سەردەمی پیغەمبەری خوا ﷺ هەبوون ، لە روالەت ئیسلام و باوەریان هەبوو بەلام لەناخیان دا بی باوەر بوون و كافر بوون ، هەر لە بەر ئەم رەفتارە ناشرینەی دوو رووه كانی سەردمی پیغەمبەری خوا ﷺ قورئانی پیرۆز چەندین ئایەتی لە سەر ئەمانەدابەزین بە تاییەتی لە سوره تی بقره دا زۆر باسی دوور رووه كان دەكات شەر زەنشتیان دەكات بە ئایەتەكانی قورئانی پیرۆز ، بەلی قورئانی پیرۆز خەلكانی دوو رووی ئەوەندە سە رزەنشت كرد هەر بەم هۆیە بە بی باوەری ناوی دە بردن ، شوینی دوو رووه كانی دیاری كرد لە ئاگری دۆزەخ دا كە ئەو خەلكانەی دوو روون لە خواری خوارەوه دۆزەخن ..!!

[3] ابن تيمية في مجموع الفتاوى ص (٧/٥٢٤ ).

هه ر وەك  خوای گەورە دەفەرموویت : ﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الْأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ وَلَنْ تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا﴾.[٤]

واتا: بەراستی دوو رووەکان لە چینی هەرە خوارە وەی ناو دۆزەخدان ، و هەر گیز بۆ ئەوان هیچ پشتیوانیەك دە ست نا کەویت ..!!

( ابن رجب ) – رەحمەتی خوای لی بیت  – دەلیت : دوو رووی گەورە  ئەوە کە مرۆڤە کە بە روالەت ئیسلام و باوەری هیناوە بە ( اللە ) و بە فریشتە کان ، پە رتوو کە ئاسمانیە کان ،وە بە  پیغەمبەران ،وە بە رۆژی دوایی ، بە لام لە ناخ و دل دەروونی دا  پیچەوانەی هەموو ئەو باوەر هینانەیە یان ئەو شتانەیە کە مرۆڤیکی ئیمانداری راستەقینە باوەری پیە تی ، ئەو لەناخی  کافر و بی باوەرە ، چونکە کفری ئەعتقادیە .[٥]

هەندیك لە زانایانی فقها یان فقە ئەو زاراوەی ( الزندیق ) لەسەر دوو روو ناوی دە بەن .

( ابن القیم )  - رە حمەتی خوای لی بیت - دەلیت : ( چینی  زندیقە کان ، ئەوە نە قەومە کەن کە بە روالە ت ئیسلام و شوینکەوو تووی پیغەمبەری خوا ﷺ ، بەلام لە دل دەروون و ناخیان دا بی باوەرن کافرن ،بەلام ئەوانە دوژمنانی خوای گەورە و  پیغەمبەرەن  ﷺ  ، ئەوانەی کە دوو روون ( اللە  ) تعالی شوینیانی دیاری کردووە ئەوانە لە خواری خوارەوەی ئاگری دۆزەخدان ).[٦]

---

[٤]- سورة النساء  ١٤٥ .

[٥]- ابن رجب  في جامع علوم والحکم (١/٤٣١).

[٦]- ابن القیم في طریق الهجرتین ص (٥٩٥).

## ب- النفاق العملی او ( النفاق الاصغر ) واته : دوو رووی کرداری دوو رووی بچووک :

ئەمە جۆرە دوو روویە پاریزگاری ناکات لە بابەتی ئاینی بە نهینی دەی هیلیتەوە ، وە رەچاو کردنی ئاشکرایی ، کە ئیمان بە ( الله ) عز وجل وە راست و دروستی باوەر یان ( الاعتقاد ) .

( ابن رجب ) – رەحمەتی خوالی بیت – دەلیت : ( دوو رووی بچووك، ئەوە دوو رووی کردارەیە یان پراکتیکی یە ، چونکە مرۆڤ خۆی وا دەردەخات و پروپاگەندەی بۆ دەکات کە کەسیکی چاکە خوازە ، بەلام لە ناخی دا زۆر جیاوازە ، وە پیچە وانەی دەر خستنەکەیەتی کە بە روالەت چاکە خوازە ).[٧]

هەروەها دوو رووی بچووك یان کرادای و پراکتیکی لە دلی موسلمانیك دا کۆ ببیتەوە لەگەل ئەصلی ئیمان و باوەردا ، ئەمە گەورە ترین تاوان و گوناهە ، بە پیچەوانەی دوو رووی گەورە ، چونکە دوو رووی گەورە نکۆلی لە ئیمان و باوەر دە کات ،هەر بۆیە دوور رووی گەورە و ئیمان بە ( الله ) کۆنابیتەوە لە نا دلی بەندە دا .

بەلام ئەگەر هەلویستیك یان حوکمیکی تەواو لە دوو رووی بچووك وەر بگرین ، ئەوا خاوە نەکەی لەم بارەیەوە خۆی وون دەکات ، بەرەو ( نفاق الاعتقادی یان نفاق الاکبر ) واتە : دوو رووی ئیمان و باوەر یان دووری گەورە دەچیت ، ئەمەش رەگ ریشەی ئاین و سەرجەمی لە ناو دەبات ..!! بەلام ( النفاق العملی ) واتە : دوو رووی کرداری یان پراکتیکی ، خاوە نەکەی تا هەتا هەتایی لە ناو ئاگری دۆزەخدا نابیت ، بەلام حوکمەکەی وەك خەلکی تاوانە گەورە کان وایە ، واتە : یەکیکە لە تاوانە گەورە کان دوو رووی بچووك ، أنشا الله خوای گەورە لە خاوەنەکی خۆش دەبیت ، وە دەی خاتە بەهەشتەوە ،وە ئەگەر بیەویت ئەشکەنچەو سزایی دەکات و لە سەر گوناهەکانی ، دواتر بەپی تاوانەکەی ئەشکەنچەی دەدات ، دەر دەهینی دەیخاتە بەهەشتەوە ..!!

---

[٧] - ابن رجب في جامع العلوم والحكم (١/٤٣١).

## نفاق یان دوو روو لە ئایندا لە چیەوە سەرچاوە دە گریت ، وە لە چیەوە نا ئاساییە :

مەبەستمان لە دوو رووی تەواو یان رەسەن ،ئەم دوو رووە یە کە پیشتر هەرگیز موسلمانیکی تەواو، و راست دروست نەبووە ..!! تەنها بە بۆ ئەوە موسلمان بووە و بۆ ئەوەی قازانجیکی یان بەرژەوەندیەکی دونیایی دەست بکەویت ..!! هەندیك لە خەلکی تەنها بە نمایشکردن و خۆ پیشاندان و پەیوەندی بە ئاینی ئیسلامەوە دەکات ،بەلام لە راستی دا تەنها نمایشە هیچ پەیوەندی بە ئیسلامەوە وە نیە ، ئەم جۆرە کەسانە باوەردار نین لە (دل ) وە ، چونکە لە یەکەم سات بریاری دوو رووی خۆی داوە پیش ئەوەی مسلمان ببیت ، کەواتە لە یەکەم چرکە ساتی ئیسلام بوونی دوو روو بووە ،ئیستاش کە موسلمان بووە هەر بەردوام دەبیت لە سەر نفاق و دوو رووی خۆی ..!!

بەلام هەندیك لە خەلکی بریاری موسلمان بوونی خۆی دەدات ، وە ئیسلام دەبیت بەراستی ، لە دوای ئیسلام بوونی دەچیتەدەروە لە ئیسلامە بە هۆی نفاق و دوور رووی ، وە دروست کردنی گومان لە دلیەوە ، لە دوای ئەوەی کە خوای گەورە چەندین تاقی کردنەوەی جیاوازی پی دەکات بۆ ئەوەی راست و دروستی ئیمانی لە ناخی دا تاقی بکاتەوە تاچەند باوەری هیناوە ، بەلام ئەو کەسە دەچیتە دەروە لە ئیسلام ، کە دەرچووە بە دەرچوونیکی ناوە خۆیی دل دەرونی لە ئیسلام دا ، بی گومان ئەو کە سانە دە ترسن لە دەچوونیان لە ئیسلام بە ئاشکرا ، هەر بۆیە بەردەوام بە ئاشکرا ئیسلامیەتی خۆیان رادەگەیەنن ،چونکە لەو حوکمانەی یان ئەو سزایانە دەترسن کە ئیسلام بۆی داناون ئەوەی حکمەکانی ( الردة ) لە سەریان جی بەجی بکریت ، وە زۆریش دە ترسن لە سوود قازانجی بەرژەوەندی دونیا ، بۆ ئەوەی بیت و وەك سیفەتیکی کەسیکی موسلمان بناسریت ، هەروەها ترسی هەیە لەوەی کە سەرزەنشت بکریت بەوەی کە لەنیو کۆمەلگای ئیسلام دا شوینی نەبیتەوە ،یان سوودەکان بەوینەیەکی ترد دەبینی ، هەروەها بەردەوامە لەسەر لە نمایشکردنی یان نیشاندانی ئیسلام لە راستیدا لە کاتیکدا ئەو کەسە ی دوو رووە کافر و دەرچووە لەئیسلام ..!!

## ترسان لە دوو روویی

بەلی زۆر بە تەندی ترساون  هاوەلانی پیغەمبەری خوا ﷺ وە لە دوای ئەوانیش ئەو کەسانەی کە پیاو چاك بوون لە ( نفاق ) یان دوو رووی ترساون  تا ئەو کاتە بوو کە هاوەلی بەریز ( أبو الدرداء)- خوا لی رازی بیت – ( ئەگەر کاتی هەبایە لەدوای شاهیدوو مان ئەوا لە نویژە کانی دا پەنای دە گرت بە خوا لە دوو رووی ، وە  زۆر پەنای دەگرت  لەم بارەیەوە ، هەروەها یەکیك  پی ووتی : ئەوە بۆ وادە کەیت ( ابو الدرداء ) ئایا تۆ  دوو رووی ..؟! ئەوویش ووتی : دە با باسی تۆ بکەین ،   بە خوا  ئەگەر پیاویك لە دینەکەی دا هەلگەریتەوە لە ماوەی یەك کات ژمیر دا  بۆیە دا دەکیشیت  ).[8]

عن حنظلة بن حذيم الحنفي رضي الله عنه قال :(( وكان من كُتَّابِ رسولِ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ- قال: لَقِيَني أبو بكرٍ، فقال: كيف أنتَ يا حَنْظَلَةُ؟ قال: قُلتُ: نافَقَ حَنْظَلَةُ، قال: سُبْحانَ اللهِ! ما تَقُولُ؟ قال: قُلتُ: نَكُونُ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ يُذَكِّرُنا بالنَّارِ وَالْجَنَّةِ حتَّى كَأنَّا رَأْيُ عَيْنٍ، فإذا خَرَجْنا مِن عِندِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ، عافَسْنا الأزْواجَ وَالأوْلادَ وَالضَّيْعاتِ، فَنَسِينا كَثِيرًا، قالَ أبو بَكْرٍ: فَواللَّهِ إنَّا لَنَلْقَى مِثْلَ هذا، فانْطَلَقْتُ أنا وَأَبُو بَكْرٍ حتَّى دَخَلْنا علَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ، قُلتُ: نافَقَ حَنْظَلَةُ، يا رَسُولَ اللهِ، فَقالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ: وَما ذاكَ؟ قُلتُ: يا رَسُولَ اللهِ، نَكُونُ عِنْدَكَ، تُذَكِّرُنا بالنَّارِ وَالْجَنَّةِ حتَّى كَأنَّا رَأْيُ عَيْنٍ، فإذا خَرَجْنا مِن عِندِكَ، عافَسْنا الأزْواجَ وَالأوْلادَ وَالضَّيْعاتِ، نَسِينا كَثِيرًا، فَقالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ: وَالَّذِي نَفْسِي بيَدِهِ، إنْ لَوْ تَدُومُونَ علَى ما تَكُونُونَ عِندِي وفي الذِّكْرِ، لَصافَحَتْكُمُ المَلائِكَةُ علَى فُرُشِكُمْ وفي طُرُقِكُمْ، وَلَكِنْ يا حَنْظَلَةُ ساعَةً وَساعَةً، ثَلاثَ مَرَّاتٍ )).[9]

---

[8] - سيرة أعلام النبلاء (٣٨٢/٦) . قال  الذهبي إسناده  صحيح .
[9] - صحيح مسلم برقم (٢٧٥٠).

واته: له حنظلة بن حذيم الحنفي – خوا لى رازى بيت – دەليت : له كتابه كەى پيغەمبەرى خواوه ﷺ فيرم بكه ، ابو بكر صديق – خوا لى رازى بيت – دەليت : ئەى حنظلة حالت چۆنه ..؟! (واته هاوەلان كاتيك به يەكترى بگەيشت بان چاك چۆنيان لەيەكرت دەكرد دەربارەى ژيانى دونيا) ، دەليت : ووتم : دوو رووى يان نافق حنظلة ، ئەويش ووتى : سبحان الله ..!! ئەو چى ده ليت ..؟! دەليت: ووتم : ئيمه له لاى پيغەمبەرى خوا ﷺ بووين يادى به هەشت و دۆزەخى بير دەخستينەوه ، هە تاكو چاو مان تى دەبرى له ديمەنەكانى به هەشت و دۆزەخ له بەر چاومان بوون ، بۆيه ئەگەر لەخزمەت پيەمبەرى خوا ﷺ دەردەچووين دەرۆيشتينەوه مالەوه تيكەلى ژن و منداله كانمان ده بووين ، ئەوا زيان مان پى ده گەيشت له بەرو بوومى ئيمان و باوەرمان ، بۆيه هەموو مان لەبير دەچيتەوه،ابو بكر ووتى : به خوا منيش بەم شيوەيه دى بينم ..!! من و ابو بكر بۆى دەرچووين بۆ خزمەت پيغەمبەرى خوا ﷺ ، ابو بكر ووتى : دوو رووى يان نافق حنظلة ئەى پيغەمبەرى خوا ﷺ ، هەروه ها پيغەمبەرى خوا ﷺ فەرمووى : ئەو ە چيه ..؟! ابو بكر دەليت ووتم : ئەى پيغەمبەرى خوا ﷺ هەركاتيك له لاى تۆ بين به ياد كردنەوەى بەهەشت و دۆزەخ بيرمان دەخەيتەوه ، وەك ئەوه وايه ديمەنەكانى لەبەر چاو مان بيت ،وه هەر كاتيك لەلاى تۆ دا دەرچووين و گەراينەوه تيكەلى ژن ومنداله كانمان بين ، ئەوا زيانمان به بەرو بوومى ئيمان باوەر دەگات ، زۆريشمان بير دەچيتەوه ، پيغەمبەرى خوا ﷺ فەرمووى : سويند بەوەى نفسى منى به دەسته ،ئە گەر تا ئەو كاتەى دل سۆزيت بۆ من بيت بەردەوام بيت له يادو زيكرى خوا ، وه فريشته كان دەستت پيوه ده گريت ، له سەر جيگا و له ريگا دا ، بەلام ئەى حنظلة كات ژمير بۆ كات ژمير ، ساعة و ساعة واته : ( ئامادە بوونت له زكر و يادى خواى گەورەه ، يان نويژه كان بكه يادى خوا بكه قورئان پيروز بخوينەوه ،يان خوا گەوره بپەرسته و يادى بكه ، يان مافى خيزان و ژن منداله كانت بده ،يان حال ژيانى دونيا به چاكى بەرى بكه چونكه سوونتى خواى گەوره يه ، به به جوانى ريك و پيكى هەولدان بۆ به هەشت بەرى بكه ..؟

بەلی مانایی ( نافق حنظلة ) واتە: حنظلة ترسی هەبوو لە دوو رووی خۆی لەو شوینەی کە لە خزمەت پیغەمبەری خوا ﷺ دا بوو لە مجلسە کەیدا کاتی باسی بەهەشت و دۆزەخی دەکرد ،ئەوەی لەسەری نیشاندەدات لەگەل بیر کردنەوە چاودیری کردن و پەسند کردنی ژیانی دوای مردن ،یان رۆژی دوایی ،ئەگەر دەربچیت ،بە ئیش و کاری ژن و مندالە کانی وە بژیوی دونیا خەریك بیت ، لە بنچەدا دوو رووی دیارە و ئاشکرایە ، بە پیچەوانەوە خراپە کاری دەشاریتەوە ، لەبەر ئەوە دە ترسا کە دوو رووی تیدا بەدی بکریت ، هەر بۆیە پیغەمبەری خوا ﷺ فیری کردوون ئەوە دوو رووی نیە ،چونکە تکلیفی یان واجبی هەمیشە لەسەر نیە ،(( کات ژمیر بۆ کات ژمیر )) واتە: کات ژمیریك ئەو ها کات ژمیرك ئەو ها ..!!.[10]

لە ( حذیفە کوری یمان ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت: ( بانگیشتکردن ( عمری کوری خەتاب ) ئەمیری باوەر داران ،دەر چووە یان ئەوەی دەویست لەگەل مردوویەك یان جنازەیەك دەر بچیت پەویوەستی بیت ، پیم ووت :ئەی ئەمیری باوەر داران دانیشە .. دەلیت ووتم ئەوە لە چ خەلکانیکە ئایا لە دوو رووە کانە یان پیغەمبەری خوا ناوی منی لە دوو رووان هیناوە ..؟! دەلیت: ئەویش ووتی : نە خیر ، بەلام دوای تۆ پەنا بۆ هیچ کەسیکی تر نادەم ..!!

لە ( کوری أبی ملیکە ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : بە سی هاوەل لە هاوەلانی ﷺ گەیشتم ، هەر هەموویان لە دوو روویی خۆیان دەترسان ،هیچ کەس لەوانە نە بوو بلیت : باوەرەکەی وەك باوەری یان ئیمانی جبریل و میکائیل وایە ( علیهم السلام ) ..!! ).[11]

[10] شرح النووي على مسلم (١٧/٦٦-٦٧).
[11]- راوه ابن أبي شيبة (٨/٦٣٧) و قال الهيثمي في المجمع (٣/٤٢) رجاله ثقات .

له (ابن القيم) – ره‌حمه‌تی خوا لی بیت – ده لیت :(سویند به‌خوا (دڵ) ی ئه‌وان پر له ئیمان و باوه‌ر و یه‌قین بوو ، ترسیان له نیفاق و دوو رووی زۆر بوو ، خه‌میان بۆ ئه‌وه خه‌میکی قورس و گه‌وره بوو ، جگه له وانه که‌سانی تر که باوه‌ره که‌یان و ئیمانه‌که‌یان له قورگیان نه‌چۆته خواره‌وه بانگه‌شه‌ی ئه‌وه ده که‌ن باوه‌ر که‌یان وه ك : باوه‌ر یان ئیمانی جبریل و میکائیل وایه ..!!).[12]

(وه دره‌باره‌ی دوو روويیه‌وه ئه‌وه یه که پیچه‌وانه‌ی ئه‌صلی یان بنچینه‌ی باوه رو ئیمانه ، به‌لام مه‌به‌ست لی ئه‌وه‌یه کۆنابیته‌وه له گه ل ئه‌صلی یان بنچینه کانی ئیمان ، که‌واته موسلمانیکی دوو روو ده‌بیت ..!! ).[13]

له (حه‌سه‌نی بصری) -ره حه‌مه‌تی خوای لی بیت -ده‌لیت : (هیچ که‌س له نیفاق دلنیا نیه جگه‌له دوو روو ،ته‌نها ئیمانداریش له دوو روویی خۆی ده‌ترسیت ..!!).[14]

له (ابن القيم) - ره‌حه‌مه‌تی خوای لی بیت – ده‌لیت : ( دره‌ختی نیفاق یان دوو روو له سه‌ر دوو ئاو ده‌روێت : ئاو ده‌ری درۆ کردن ،وه ئاوده‌ری ریا بازی ..!! ).[15]

---

[12] - ابن القيم في مدارج السالكين (٣٥٨/١).
[13] إحياء علوم الدين (١٧٢/٤).
[14] - ابن القيم في مدارج السالكين به كوردي ص(٣٢٨/١).
[15] - ابنالقيم في مدارج السالكين بةكوردي ص (٣٣٢٨/١).

# سیفاتەکانی دوو روویی لە قورئان و فەرمووده

ئەوەی هاتووه لە سیفاتی مونافق یان دوو روو لە قورئـانی پـیرۆز دا ، وه لـه سنەتی یـان فەرمووده پـاك بیگـەرده کـانی پیغەمبـەری خـوا ﷺ ،لـه چـەند باسیك دا سـیفاتەکان نیشانبدەین ، وه ك : هۆشداریەك یـان ئاگـادار کردنەوەیـەکی بـاوەر دارن و موسـلمانان ، هەتاکو خوای گەوره سـوره تیکـی تایبـەتی دەربـارەی سـیفەتەکانی موناـفق یـان دوو روو دابەزاندوه بۆ ئیمان داران ..!!

بەلی خوینەری بەرزی سیفاتەکانی دوو روو زۆرن بەلام نوو سـەری ئـەم کتابـە تـەنها ( ٣١ ) سیفاتی باس کردووه بۆ خوینەرانی ، هەروەك ئەم سیفاتانەی دوو روو لە کردەوەخرا پە کانی ( دلّ ) و دەروونی مرۆڤە ، چونکە ئەگەر ( دلّ ) خراپ و پیس بیت ئەوا هەموو لاشـەی مـرۆڤ دە گریتەوه ، هەربۆیە ( الشیخ محمدصالح المجند ) خوای گەوره بیپاریزی پایە داری بکـات لـه دونیاو لە دوا رۆژدا وه پاداشتی خیر بداتەوه چونکە گـەلیك پـەرتووکی بەسـوودی هەیـە ، کۆمەلیك پەرتووك کە بەناوی زنجیره یەك لە کردەوەکانی دلّ ( سلسلە اعمـال قلـب ) یـان ( مفسدات قلب ) کردوه خرا پە کانی ( دلّ ) ئیمەش پشتیوان بە خوا هەندیك لەم پەرتووکانـە وەردەگیرین بۆ سەر زمانی شیرینی کوردی بە پی توانا خۆمان ئەگەر هەر کەم کوریك هەبیت ، لەرووی زمانەوانی لیمان ببورەن ، بەلی کۆمەلیك سیفاتی موناـفق یان دوو روو لەم پەرتووکە دا وەردەگیرین بۆ سەر زمانی شـرینی کـوردی ،سـیفاتەکانی لـه قورئـان و فـەرمووده کـانی پیغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی خوشەویست باس دەکەین بە پشتیوانی خوا ..!!

## (١)-نەخۆشی دڵ و دەروون :

**قال الله تعالى :** ﴿فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ فَزَادَهُمُ اللَّهُ مَرَضًا وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ﴾ .[١٦]

واتا : ئەوان لە (دڵ) و دە روونیاندا نەخۆشی بی ئیمانی یان بی باوەری و حەسوودی و کینە هە یە ، خوای گەورەش دەردیان گران و قورس کاریگەر دە کات وە سزایەکی زۆر بەئیش و سەختیش (لە دونیا و لە دوا رۆژدا) چاوریتانە بە هۆی ئەو درۆکردن و دژایەتیان بۆ ئیسلام .

لە(ابن القیم) – رەحمەتی خوای لی بیت – دەلیت : ( رەنگە نەخۆشی ماندوو بوونی گومانەکان و ئارەزوو بازەکان بیت کە دڵ دەروونیان ماندوو دەکات ، هەندیك جار مەبەست لی خرا پە کاری لە سەر ئیرادەکانیان و مەبەستە کانیان بۆ گەندەلی و خرا پە کاریە ، چونکە گەندەلی و خرا پەکاری لیدانە بۆ هیلاك و ماندوو بوون، سستبوونی (دڵ) وە پزیشکەکان پی دەزانن ..!! کە خوای گەورە دەفەرموویت : ﴿فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ فَزَادَهُمُ اللَّهُ مَرَضًا﴾ واتا : ئەوان (دڵ ) دە روونیان پر بووە لە نە خۆشی گومان و حەز و شهوت بازی تیا بردوون ، مەبەست و مەرامی خراپ زاڵ بوون بەسەر ویست و ئارەزوو نیە تیاندا تیکیداوە بە سەر یەکدا تیکچوونی ئەوانە سەری لە تیاچوونەوە و پزیشکە عاریفە کان لی دەستەوە سانن نایزانن سەریان سورماوە ..!!).[١٧]

---

[١٦] سورة البقرة (١٠).
[١٧] - ابن القيم مدارج السالكين (٣٤٩/١).

## ( ٢ )- چاوچنۆكی تەماحی دونیا و شەهوەت بازی :

**قــال الله تعــالى :** ﴿فَلَا تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ فَيَطْمَعَ الَّذِي فِي قَلْبِهِ مَرَضٌ وَقُلْنَ قَوْلًا مَعْرُوفًا﴾.[١٨]

**واتا : نەوەك دلی نەخۆشە كان بووروژێت و نیازخراپ بكات ، هەمیشە و بــەردەوامیش قســەی چاك و بەجی بكەن كە هیچ كەس نەتوانیت رخنەی لی بگریت ..!!**

**بەلی ( خوای گەورە ) دەفەرموويت : ئەوە لە دڵ ی لاوازە وەیە ، چونكە ئیمانی لاوازە لە نــاو دڵ و دەروونی دا، سەبارەت بە ئیسلام بوونی گومانی هەیە ئــەوە دوو رووە ، هــەر بۆیــە ئــەو كەسە بە كەم سەیری فەرمان و سنوورە كانی خوای گــەورە دە كــات ، وە بــی باكــە یــان كــەم تەرخەمە لە وەی كە هەر كردەوەیەكی قیزەون فاحیشە یەك ئە نجام بدات ..!! ).[١٩]**

---

[١٨] - سورة الاحزاب (٣٢)
[١٩] - الطبري في التفسير جامع البيان (٢٠/٢٥٨).

## ( ٣ )- خۆ بە زلزانین یان خۆ بە گەورە زانین :

**قــال الله تعــالى :** ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ اللَّهِ لَوَّوْا رُءُوسَهُمْ وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ وَهُمْ مُسْتَكْبِرُونَ﴾.[٢٠]

**واتا : کاتێك پێیان بووترێت : وەرن پێغەمبەری خوا ﷺ ، داوای لێخۆشبوونتان بۆ دەکات ، سەر دەدەن و لووت بەرزی دەکەن ، دەیان بینێت روو وەردەگێرن و بەر هەڵستی دەکەن ، لە کاتێکدا ئەوانە خۆیان لا گەورە دەبێت و خۆ بە زلزانن ..!!**

**بەلێ ( خوای گەورە ) دە فەرمووی : هەواڵی پێ ڕاگەیاندین لەسەر دوو رووە کان ، کە نەفرەتی خوا لەسەریانە کە پێیان دەفەرمووی :** ﴿ تَعَالَوْا يَسْتَتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ اللَّهِ لَوَّوْا رُءُوسَهُمْ وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ وَهُمْ مُسْتَكْبِرُونَ﴾ . **واتە : بەر هەڵستی ئەنکاری و دە کەن ئەوان دەڵێن : ك خۆیان بە گەورە زان و زلزانن ،هەروە ها گاڵتە دە کەن ، هەر وەك خوای گەورە دەفەرموویت** ﴿وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ وَهُمْ مُسْتَكْبِرُونَ﴾ **لە پاشان پاداشتی پێدانەوەی لەسەری ،مەبەستی پاداشتی موسلمانانە کە هەرگیز خوا لە دوو رووە کان خۆش نابێت کە دوای لێ خۆش بوونیان بۆ بکە یت . خوای گەورە دەفەرموویت :** ﴿ سَوَاءٌ عَلَيْهِمْ أَسْتَغْفَرْتَ لَهُمْ أَمْ لَمْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ لَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ﴾ .[٢١]

**واتا : ئەگەر تۆ داوای بەخشینیان یان داوای لێ خۆشبوونیان بۆ بکەی و ،وە یان دوای بەخشینیان بۆ نەکەی یان داوای لێ خۆشبوونیان بۆ نەکەی ، بۆ ئەوان هیچ جیاوازی نیە ، هەرگیز خو دا نایانبەخش لێ یان خۆش نابێت ، خو دا گرۆی لەری لادەران بەرەو خۆی شارە زا ناکات ..!! .**[٢٢]

---

[٢٠] - سورة المنافقون (٥) .
[٢١] - سورة المنافقون (٦).
[٢٢] - ابن كثير في تفسير القران العظيم (٤/٤٧٣).

## (٤)- گاڵته كردن به ئایەتەكانی پەروەردگاری جیهانیان :

**قال الله تعالی :** ﴿يَحْذَرُ الْمُنَافِقُونَ أَنْ تُنَزَّلَ عَلَيْهِمْ سُورَةٌ تُنَبِّئُهُمْ بِمَا فِي قُلُوبِهِمْ قُلِ اسْتَهْزِئُوا إِنَّ اللَّهَ مُخْرِجٌ مَا تَحْذَرُونَ﴾ .[٢٣]

**واتا : دوو رووه كان ده ترسن لەوەی سوورەتیك دابه زینریته سەریان ، هەوالیان بداتی ئەوەی له ( دڵ ) و دەروونیاندایه ، پییان بلی : گاڵته بكەن ..!! بی گومان لی دەترسن خوا هەر ئاشكرای دەكات بۆ خۆتان و بۆ خەلكیش ..!!**

**بەلی دوو رووه كان ، كاتیك سوورەتی المنافقون دابەزه سەریان بۆ ئاگادار كردنەوەی یان تەبی كردنی ( دڵ ) و ده روونیان ..!! یان دەركەوتن و ئاشكرا كردنی ( دڵ ) دەروونی باوەر داران یان ئیمانداران ..!! خوای گەوره ئەم ئایەتەی نارده خواره وه لەسەر پیغەمبەری خوا ﷺ ..!! چونكه دوو رووه كان گاڵته و كپ و تانەو عیب و عاریان ده گرت له پیغەمبەری خوا ﷺ ..!! وه هەندیك شت فەرمان یان فەرمان به سەر موسلمانان درا ، دەلین : نزیكه خوای گەوره نهینیه كانیان ئاشكرا ناكات ، هەروەها خوای گەوره دەفەرموویت : به پیغەمبەره كەی ﷺ پییان بلی گاڵته بكەن ﴿اسْتَهْزِئُوا﴾ ..!! وه هەرەشەی لیان كرده به شیوەیه كی هەره شه ئامیز ..!! كه دەفەموویت : ﴿إِنَّ اللَّهَ مُخْرِجٌ مَا تَحْذَرُونَ﴾ واته : بی گومان ئەوەی لی ده ترسن خوای گەوره هەر ئاشكرای دەكات بۆ خۆتان و بۆ خەلكیش ..!! .[٢٤]**

---

[٢٣] - سورة التوبة (٦٤).
[٢٤]- الطبري في التفسير جامع البيان (٣٣١/١٤).

## (٥)- گاڵتە کردن بە موسلمانان :

**قال الله تعالى :** ﴿وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ آمَنُوا قَالُوا آمَنَّا وَإِذَا خَلَوْا إِلَى شَيَاطِينِهِمْ قَالُوا إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِئُونَ (١٤) اللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ وَيَمُدُّهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾ .[٢٥]

**واتا : کاتێکیش (دوو ڕووە کان ) دە گەن بەوانەی باوەڕیان هێناوە دەڵێن : ئێمە ئیمانداریـن و باوەڕمان هێناوە ..!! کەچی کاتێك بە تەنها دە مێنەوە لەلای شەیتانە گەورە و فێلبازە کانیان دەڵێن : بەڕاستی ئێمە لە گەڵ ئێوەین ،بێ گومان ئێمە تەنها گاڵتەیان پێدە کەین و پێیان ڕادە بوویرین ..!! بە لام خەیاڵیان خاوە چونکە خوای گەورە سزای گاڵتە جارییە کە یان لێدەستێنێت و ( دەیان کاتە پەندو عیبرت و گاڵتەجار ) ئەوە جاری بەرە لای کردوون تا کوێرانە مل بنێن و درێژە بە گومرایی خۆیان بدەن ..!!**

**لە(ابن القيم ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – دەڵێت : بۆ هەر یەکێکیان دوو ڕوخساریان هەیە : ڕوخسارێکیان لە شێوەی ئیماندار دەکات ، ڕوخسارێکی تریان گۆڕیوە بۆ خیانەتکارانی بێ ئیمان و بێ ئاینەکان بەر هەڵستکارنی ئاینی ئیسلام ..!! وە ئەوانە دوو زمانیان هەیە : یەکێکیان بە ڕواڵەت گۆڕیوە بۆ سەر شێوەی موسلمانان ، ئەوە زمانی دووەم وەریان گێراوە بۆ نهێنی و شتە شاراوەکان ..!! وە نیشانی داوە لە وقوئان و فەرموودە کانی پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئەوانە گاڵتەو سووکایەتی بە خۆیان بە خێزانەکانیان دە کەن ، وە ڕخنە لە حوکمەکان دەگرن و دڵ یان پێ خۆشە بەوەی کە ئەو زانینانەی کە هەیانە هیچ سوودێکیان بۆ نیە تەنها زیادە ڕەوی کردنە،تەنها ئەوانە شەڕانگێز خراپە کارو خۆ بەزلزانن ، هەرگیز نابینرین کە پێوەست بن ، ڕاشکاوانە الوحی دابە بەزێت بە گاڵتە کردنیان** ﴿اللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ وَيَمُدُّهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾.[٢٦]

---

[٢٥] سورة البقرة (١٤-١٥).
[٢٦] - ابن القيم مدارج السالكين (١/٣٥٠).

## ( ٦ )- بەرهەڵستن هانی خەڵکی دەدەن بۆ دوو روویی وەکو خۆیان :

**قــال الله تعــالى :** ﴿هُمُ الَّذِينَ يَقُولُونَ لَا تُنْفِقُوا عَلَى مَنْ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ حَتَّى يَنْفَضُّوا وَلِلَّهِ خَزَائِنُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا يَفْقَهُونَ﴾.[٢٧]

**واتا : ئەوانە كەسانێكن دەڵێن : بە خەڵكی : ماڵ و سامان و مەبە خشن بەو كەسانەی كەلە دەوری پێغەمبەری خوا دان ﷺ ، تا بلاوەی لێ بكەن ..!! ( مەبەستیان هەژارانی كۆچ كەرانە ،ئەی نازانن ) هەرچی گە نجیە نەكان هەیە لە ئاسمانەكان و زەویدا هەر خـوا خاوەنیانـە ، بەڵام دوو رووە كان ئەم راستیە تیناگەن و لە نهێنییە كان سەر دەرناكەن ..!!**

**عن ( زيد بن أرقم ) رضي الله عنه قال :** (( كُنْتُ في غَزَاةٍ فَسَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بنَ أُبَيٍّ، يقولُ: لا تُنْفِقُوا علَى مَن عِنْدَ رَسولِ اللَّهِ حتَّى يَنْفَضُّوا مِن حَوْلِهِ، ولَئِنْ رَجَعْنَا مِن عِنْدِهِ لَيُخْرِجَنَّ الأعَزُّ منها الأذَلَّ، فَذَكَرْتُ ذلكَ لِعَمِّي أوْ لِعُمَرَ، فَذَكَرَهُ للنبيِّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ، فَدَعَانِي فَحَدَّثْتُهُ، فأرْسَلَ رَسولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ إلى عبدِ اللَّهِ بنِ أُبَيٍّ وأَصْحَابِهِ، فَحَلَفُوا ما قالوا، فَكَذَّبَنِي رَسولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ وصَدَّقَهُ، فأصَابَنِي هَمٌّ لَمْ يُصِبْنِي مِثْلُهُ قَطُّ، فَجَلَسْتُ في البَيْتِ، فَقالَ لي عَمِّي: ما أرَدْتَ إلى أنْ كَذَّبَكَ رَسولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ ومَقَتَكَ؟ فأنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: {إذَا جَاءَكَ المُنَافِقُونَ} فَبَعَثَ إلَيَّ النبيُّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ فَقَرَأَ فَقالَ: إنَّ اللَّهَ قدْ صَدَّقَكَ يا زَيْدُ )).[٢٨]

---

[٢٧] - سورة المنافقون (٧).
[٢٨] صحيح البخاري برقم (٤٩٠٠) ، و مسلم برقم (٢٧٧٢).

واته : له زیدی كوری ئەرقم وە – خوا لی رازی بیت – دەلیت : جاری له خزمەتی مام دا بووم ، له غەزایەكدا ، گویم لی بوو ( عبدالله كوری ئوبەی كوری سەلول ) دەی ووت : مالی خۆتان بۆ ئەوانه خەرج مەكەن ، كه ئەوانەی لەگەل پیغەمبەری خوا ﷺ دان ، هەتا بلاوەی لی بكەن بەر هەلستی بكەن ،وە دەی ووت :ئه گەر گەراینەوە بۆ شاری مەدینه ، لەوی له ئیمەو له هاوەلانی دەستیەی ﷺ كامان بەدەست و وەبە دەسەلات و ئازاتر بی ،شاری مەدینەی بەدەسته ، ئەوەی بی دەسەلاته كەی ترمان مەدینه چۆل دە كەین ..!! زیدی كوری ئەرقم ئەلیت : منیش ئەمەم بۆ مام واته : ( عمری كوری خەتاب ) گیرایەوە ..!! ئەویش بۆ پیغەمبەری خوای ﷺدەگیریتەوە ..!! پیغەمبەری خواش ﷺ ناردی به شوین ( عبدالله ی كوری ئوبی كوری سەلول ) وە هاوریكانی دا ، باسه كەیان بۆ باس دە كا، كه ئیوە شتیكی واتان وو تووە ..؟! ئەوانیش نەكۆلیان لی كرد یان حاشایان لی كرد و ، به درۆ سویندیان خوارد كه ئیمه قەسەی وامان نه كردووە ..!! وە پیغەمبەری خوا ﷺ باوەری به وان كرد باوەری به من نەكرد ..!! منیش تووشی خەمیكی وا بووم ، وە هەرگیز تووشی خەمی وا نەبوو بووم ، له مالەوە دستەو ئەژنۆ به خەم و پەژارەو خەفەتەوە لی دانیشتم تا خوای گەورە ی زاناو بالادەست پایەدار و خاوەن شكۆ ئەم ئایەتەی قورئانی ناردە خوارە وە كه دەفەرموویت : ﴿إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ﴾ .[29] واته :( ئەی پیغەمبەی خوا ﷺ كاتیك ناپاكان دوو رووە كان دین )یان ئایەتی ﴿يَقُولُونَ لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الْأَعَزُّ مِنْهَا الْأَذَلَّ وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ﴾ .[30] جا پیغەمبەری خوا ﷺ ناردی بەشوین من دا و ، ئایەتەكانی بۆ خویندمەوە فەرمووی : ئەی ( زید كوری ئەرقەم ) قسه كەت راست دەرچوو ..!! جۆ نت ووت وا دەرچوو ..!! ئەوە تانی خوای گەورە راستی قسەی تۆی دەرخست ئەوانی بەدرۆخستەوە ..!!

---

[29]- سورة المناقون (١).
[30]- سورة المناقون (٧) .

## ( ٧ )-گەمژەیی وە لیدان لە ئیمانداران بە گەمژەیی یان بەسفیهی :

**قـــال الله تعـــالی :** ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ آمِنُوا كَمَا آمَنَ النَّاسُ قَالُوا أَنُؤْمِنُ كَمَا آمَنَ السُّفَهَاءُ أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ السُّفَهَاءُ وَلَكِنْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ .[٣١]

**واتا : کاتیك پیان دە وتریت : ئیمان و باوەر بهینن وە کو ئەو هەموو خەلکە ،بی فیـل راسـت گۆیانە کە ئیمان و باوەریان هیناوە ، ئەوا دەلین : چۆن ئیمە وەکو ئەو خەلکە گەمـژە و کـەم عەقل و گیلانە باوەر دەهینین ..!! خەلکینە چاك بزانن و ئاگادار بن کە هەر ئەوانە خۆیـان گەمژەو کە عەقل و گیل و نەفامن ، بەلام بۆ خۆیان نازانن ..!!**

**لە ( ابن القیم ) -رەحمەتی خوای لی بیت – دەلیت : پابەند بوون بە قورئان و فەرموودە یان سوونەتی پیغەمبەری خوا ﷺ خاوەنی درەو شاوە کانە ..!! بەخت بەکەم زانین لـە مشـیك و عەقل دا ، لە چوارچیوەی یان بازنەی دەقە کان دا ، لەلای ئەوان کە وەك ئەوە وایە گودریـژ باری کتابی هەلگرتبی ، تەنها لەوە تی دە گات کە گەینەرە یان دە گوازیتەوە ،هەندیك کەل و پەلی پی یە و بازرگانە نە دەتوانیت بیفرۆشیت نەدەش توانیت کـەل وپـەل کریـت ،هـەر شتیکی پی بیت کەس نەرخ و بەهای بۆ دانانیت ،بی گومان ئەوانەش ئەو کەسانەن کە خەلکی گەمژە و کەم عەقل و گیلن، تی دە گەن لە کور کۆبوونەوە دانیشتنە کانیان کـە چـۆن دەفـرن ..!! .[٣٢]**

---

[٣١]- سورة البقرة (١٣).

[٣٢] - ابن القیم في مدارج السالکین (١/٣٥٠).

## ( ٨ )- هاوسۆزی بۆ بی باوەران یان کافران دەدەبرن :

**قال الله تعــالى :** ﴿بَشِّرِ الْمُنَافِقِينَ بِأَنَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا (١٣٨) الَّذِينَ يَتَّخِذُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِ الْمُؤْمِنِينَ أَيَبْتَغُونَ عِنْدَهُمُ الْعِزَّةَ فَإِنَّ الْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا﴾.[٣٣]

**واتا : ئەی پیغەمبە ری خوا ﷺ مژدە بە دوو رووە کان بدە کـە بـە راسـتی سـزایە کـی بـە ئیشیان بۆ ئامادە کـراوە ..!!ئـەو دوو رانـە کـافران و بـی بـاوەران دە کـەن بەهاوسـۆزی و پیشتیوانی و یاوریاوەری خۆیان ..!! لە جیاتی ئیمانداران و باوەر داران ، ئایا دەیانـەویت عیزت و دەسەلات و سەر بەرزیان لای ئەوان دەست بکەویت ..؟! ئەوانە بەهەلە دا چـوون ..؟! چونکە بەراستی عیزە و بالادەستی و سەر بەرزیی هەر بۆ خوای گەورەیە ..!!**

**بەلی خوای گەورە بە پیغەمبەری فەرمووە : ئەی ﷺ** ﴿بَشِّرِ الْمُنَافِقِينَ﴾ **ئەوانە پەیوەست بـە بی باوەران و کافران ەبن وە بی دینی و ئینکاری دەکەن لە پیاو چاکانی ئەنصارە کان واتـە : هاوەلانی پیغەمبەری خوا ﷺ لە ئەنصارە کان ، وە تـرك و جیهشـتنی ئیمانـداران دەکـەن** ﴿أَيَبْتَغُونَ عِنْدَهُمُ الْعِزَّةَ﴾ **دە تانەویت بە هیز بەرگریتان لی بکەن لە جیاتی پیاو چـاکانی خەلکی ئیماندار یان باوەر دار ،** ﴿فَإِنَّ الْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا﴾ **دەفەرموویت : ئەوانە پەیوەست بـە بی باوەر و کافران دەبن ،ئایا دەتانەویت عزە ت و دەسەلات و سەربەرزی دەست کـەویت ، لـە چەند کەسە زەلیکراوە ، پەیوەست بن بە پیاوچاکانی ئیمانداراە ،دەستی پیوە بگـرن چـونکە عزەت سەر بەزری و سەرکەوتن تەنها لە لای خوای گەورە یە چونکە عزت و بەرگری کار تەنها ئەو زاتەیە چونکە هە رکەسیك بیەویت عزەت سەر بەرزی پی دەبەخشـیت ،وە هـەر کەسـیك بیەویت زەلیکراوە سەر شۆری دە کات ، هەر ئەو زاتە عزە ت بەرگری کارە ..!!**[٣٤]

---

[٣٣] سورة النساء (١٣٨-١٣٩).
[٣٤]- االطبري في التفسير جامع البيان (٣١٩/٩).

## ( ٩ ) خەریکی خۆ دزینەوە ن چاوە روانن بزانن ئیماندااران سەردەکەون یان شکست دەهینن :

**قال الله تعالی :** ﴿الَّذِينَ يَتَرَبَّصُونَ بِكُمْ فَإِنْ كَانَ لَكُمْ فَتْحٌ مِنَ اللَّهِ قَالُوا أَلَمْ نَكُنْ مَعَكُمْ وَإِنْ كَانَ لِلْكَافِرِينَ نَصِيبٌ قَالُوا أَلَمْ نَسْتَحْوِذْ عَلَيْكُمْ وَنَمْنَعْكُمْ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ فَاللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلَنْ يَجْعَلَ اللَّهُ لِلْكَافِرِينَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ سَبِيلًا﴾.[٣٥]

**واتا : ئەوانەی کە خۆیان مەلاسداوە چاوەروانی ئیوە دەکەن کە چیتان بە سەر دیت ، ئەگەر سەر کەوتنیکتان لە لای خواوە دەست بکەویت..!! ئەوا دەلین : ئەی ئیمە لە گەلتاندا نەبووین ..؟! خۆ ئەگەر بی باوەرە کان یان کافرەکان سەر کەوتوونیایە ،ئەوا دوو رووە کان دەلین : ئایا ئیمە لەسەر ئیوەمان نەدەوە و ، وە نەمان هیشت موسلمانان زیاتان پی بگەیەنیت ..!! ئینجا خوای گەورە لە رۆژی قیامەت دا دادوەری دەکات لە نیوانیتاندا ( ئەی بی باوەرو دوو رووە کان ) دلنیابن هەرگیز خوا نایە لیت بی باوەران بەسەر ئیمانداران دەست رۆیشتوو بن و ریشە کیشیان دەکات ..!!**

**فەرموودەی ( خوای گەورە ) واتا : شایستە کە دە فەرمووی :** ﴿الَّذِينَ يَتَرَبَّصُونَ بِكُمْ﴾ **ئەوانە چاوەروانی ئیمانداران دە کەن** ﴿فَإِنْ كَانَ لَكُمْ فَتْحٌ مِنَ اللَّهِ﴾ **واتا : ئەگەر ئیمانداران خوای گەورە سەر کەوتنی پی بەخشین لە بەرانبەر دوژمان و کافراندا ،ئەوا ئەوان دوو رووە کان ئەلین : ئیمە لە گەل ئیوە دابووین ،ئەوە ش تەنها بۆ دەست کەوتی غنیمەتی جەنگە ئەو قسە دە کەن ئەلین : ئیمەش لە گەل ئیوە لە گەل کافراند جەنگاوین ئەوەی کە دەست ئیمانداران کەو تووە بەشی ئیمەشی لی بدە ، چونکە ئیمە لە گەل ئیوە کوشتارمان دە کرد ، وە ئە گەر دوژمنە کانتان واتا :کافررە کان** ﴿وَإِنْ كَانَ لِلْكَافِرِينَ نَصِيبٌ﴾ **واتا :بە سەر ئیوە دا سەر کەوتن ئیوە شکستان خوارد ، : ئەوا دەلین :**﴿ قَالُوا﴾ **دوو رووە کان بەو بی باوەرانە یان کافرانە** ﴿أَلَمْ نَسْتَحْوِذْ عَلَيْكُمْ﴾ **واتا : ئایا ئیمە لە گەل ئیوە دا نەبووین کە شکستمان هینا بە ئیمانداران ،ئیمە پالپشتی ئیوە مان دەکرد..!! یان پیان دەلین : ئایا ئیمە زال مان بەسەر ئیمانداران ، ئیوە مان نە پاراست لە ئیماندران دا ..؟! واتە : هونەرو ئازایەتی ئیمەبوو کەبەسەر ئیماندران سەرکەوتن ..!!** ﴿فَاللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ **واتا : خوای گەورە لە رۆژی دوای دا دادوەری دە کات لە نیوان ئیماندران و دوو رووە کان دا ، قضاء دادوەری جیاکاری لە نیوان ئەهلی ئیمان و ئەهلی دوو روو یان النفاق دە کات ..!! دوو رووە کان لە گەل بی باوەرانن لە ناو ئاگری دۆزەخدا ..!! .[٣٦]**

---

[٣٥] سورة النساء (١٤١).

[٣٦] - الطبري في جامع البيان (٩/٣٢٤).

## ( ١٠ )- فيل بازو تەلە كەبازن يان تەمەل و لەش گران و ( ريا ) بازن بۆ نويژ:

**قال الله تعالى :** ﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَهُوَ خَادِعُهُمْ وَإِذَا قَامُوا إِلَى الصَّلَاةِ قَامُوا كُسَالَى يُرَاءُونَ النَّاسَ وَلَا يَذْكُرُونَ اللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا﴾.[٣٧]

**واتا : بەراستی دوو رووه كان واده زانن فيل له خوا دەكەن له كاتيك دا ئەو زاته فيله كانيان پووچ و رسوا دەكاتەوه ، ( نازانن كه ديار ناديار لای خوای گەوره روون و ئاشكرايه ) هەر كاتيكيش بۆ ( ريا ) ريا بازی و روو پەمەيی هەلدەستن بۆ نويژ ، زۆر به لەش گرانی و تەمەلی نويژه كانيان ده كەن يان هەلده ستن ،ئەوانەی فيل بازی و ( ريا ) ی روو پەمەيی بۆ خەليكی ده كەن ،زۆر بەكەم يادی خوا ده كەن ..!!**

**دوو رووه كان به مەزەندەی خۆيان يان به بيشبينی كردنی خۆيان ، به مال و به خوينيا بۆ جەنگ كردن خوا و ئيماندران هەلدەخەلتەتينن ، كەچی نازانن گيل و نەفام و گەمژەن ، كه( خوای گەوره ) زۆر لەوانه شارازاترو زاناتره به ( دڵ ) دەروونيان ، خوينيان نارژينيت وه بۆ ئەوەی خۆيان بيدا به دريار بخەن بلين : ئيمه له گەل پيغەمبەری خوا ﷺ و ئيماندران خوينمان رژاند ..!!له گەل ئەوەی كه زانراوه له ( دڵ ) و دەروونيان دا له ناوه هيچ ويژدان و زميريان نيه ،وه باوەريان به كافرانه نەوەك به ئيمانداران ، ئەوانه دابراون يان دەرچوون له ژيانی دونيادا، وه تەنانەت چاو يان هەلنايەت له دوا رۆژ دا ، ناتوانن بەرگری لەخۆيان بەكەن دەيان خەنه ناو ئاگری دۆزه خەوه له گەل كافران و بی باوەران دا ..!!**

[٣٧] - سورة النساء (١٤٢)

خوای گەورە دەفەموویت : ﴿وَإِذَا قَامُوا إِلَى الصَّلَاةِ قَامُوا كُسَالَى يُرَاءُونَ النَّاسَ﴾

واتا : دوو ڕووەکان هیچ نازانن دەربارەی ئەو کردەوانەی کە ( خوای گەورە ) فەرمانی کردووە یان واجب و فەرزە کردووە لە سەر ئیمانداران دا بەشێوەیەك کە لە خوای گەورە نزیك ببنەوە ، چونکە ئەوان دلنیان لەوەی هیچ بەروارێك نیە کە تیدا نە پاداشتیان هەیە و نە سزایان هەیە ، ئەوان تەنها ئەو کردەوانە دەکەن کە کردوویانە لە کردارە ڕوالە تەکانیان دا ، تەنها بەس بۆ ئەوەی بۆ خۆیان بژین ، ئاگاداری بن لە و ئیماندرانە بۆ ئەوەی بیان کوژن و دزیان لی بکە یان مال وسامانیان ببەن ، هەر کاتیك بانگیان دە کە هەبستن بۆ نویژ کردن ئەوە لە جواب و فەرزە دیارە کان ، کاتیك هەلدەستن زۆر بە تەمەلی و شەلگرانی و قورسی هەلدەستن بۆ نویژ کردن ، کاتیکیش هەلدەستن بۆ نویژ تەنها بۆ ( ریایی ) ڕوو سپی کردنی خۆیانە لە ناو ئیمانداران دا ، کە وا حیساب بکرین یان هەژمار بکرین کە ئیمانداران ، بەلام ئەوان لە ئیمانداران نین هەرگیز ..!! چونکە ئەوانە کاتیك هەلدەستن بۆ واجب فەرزەکان هیچ باوەریان پی نیە ،تەنها کاتیك هەلدەستن بە لەش گرانی و تەمەلی نەبیت ( کسالی ) ..!! وە خوای گەورە دەفەرموویت : ﴿وَلَا يَذْكُرُونَ اللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ واتا : ئایا یادو ذکری خوای گەورە شتیکە کە بە کەمی دەی کەن ..!؟ پی ووتن : ئەگەر واتای ئەوە جگە لەوەی بۆی نەچیت ، بەلام ئەوە واتا کەیەتی : یاد و ذکری خوا ناکەن ،نەنها بۆ ( ریایی ) یاد و ذکری خوا دە کەن " ، تەنها بۆ ئەوە نەبیت کە بەرگری لە خۆیان بکەن بۆ ئەوەی نەکوژرین نەفەرت لی نەکرین و مالو سامانیان بەتالان نەبردیت ، بیرناکەوە لە دلنیایی ڕاست و دروستی یەکتا پەرستی خوای گەورە ، وە دڵ سۆز بیت بۆ پەروەردگاری ، بۆیە ناوی خوا کەمە ( والعیاذ باللە ) ..!؟ چونکە مەبەستی لە خوای گەورە نیە ..!! وە ئاواتیش ناخوازن بەوەی کە لە خوای گەورە نزیك ببنەوە ..!! وە مەبەستیان پاداشت نیە لە خوای گەورە ..!! وە ئەوە ئەگەر زۆریش بیت یان زیاتربیت لە ڕووخساری ئامادە کراو چارە سەری بکە بە یاد کردنەوەی کە واتاکەی سراب بیت لە شوینی دیار دا بەلام لە ڕاستی دا ئاو نیە ، ووشەی ( السراب ) وە ك تەمیك یان ئاویکی زۆر وایە لە بیاباندا لە بەر چاوت دا لەدوو ڕە وە وا ئەزانی ئەو شوینە پڕە لە ئاو بەلام کاتیك گەیشتی بەم شوینە ئاو نیە ڕاستیە کەت بۆ دەر دەکەویت حقیقی ئەوشوینەت بۆ دەر دەکەویت کە ( السراب ) ئاو نیە ) ..!! .[38]

---

[38] - الطبري في جامع البیان (٣٢٩/٥).

**( ١١ )- دوو دڵ و راران و ( ترددن ) گیریان خواردووە لەنیوان موسلمان بوون و کافر بوونیان:**

**قال الله تعالى :** ﴿مُذَبْذَبِينَ بَيْنَ ذَلِكَ لَا إِلَى هَؤُلَاءِ وَلَا إِلَى هَؤُلَاءِ وَمَنْ يُضْلِلِ اللَّهُ فَلَنْ تَجِدَ لَهُ سَبِيلًا﴾.[٣٩]

**واتا: ئەوانە گیریان خواردووە لەو نیوانەدا ، نە ئەوەیە پال بدەن بە ئیماندارانەوە ، نە ئەوەشە پال بدەن بە کافرانەوە ، هەرکەس خوا ( بەهۆی نالەباریی خۆیەوە ) گومرایی بکات ،ئەو هەرگیز ناتوانیت ریبازیکی راست و رزگارب بۆ بدۆزیتەوە ..!!**

**( دوو رووە کان ) دوو دل و راراو سەر سوماون یان سەر لی شیواون لە ئاینە کەیان ، ناگەرینەوە بۆ لای باوەر بەشیتك ناکەن کەلەسەر راست و دروستی بیت ، نە ئەوە شە لە گەل ئیماندران بن بۆ بەرچاو رۆنیان یان چاو رۆشنکردنەوە یان بینینیان روو ناك بکاتەوە ، و نە لە گەل کافران و موشریکان لە سەر نەفامی و جهالت ، بە لام ئەوان سەریان لە خۆیان شیواندوە یان شیواون لە مەدا ..!! ).[٤٠]**

**لە ( عبد الله بن عمر ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : لە پیغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :**

**(( مَثَلُ الْمُنافِقِ كَمَثَلِ الشَّاةِ العائِرَةِ بيْنَ الغَنَمَيْنِ" تَعِيرُ إلى هذِه مَرَّةً، وإلَى هذِه مَرَّةً )).[٤١]**

**واتا: ( دوو روو ) وەك مەری ئاوەکی وایە ، ویل و سەرگەردان و رارایە ، جاری بەم لایەدا دە سوریتەوە جاری بەو لایداو حول حولی دەبی و سەری لی دەشیوی رانە مەرە کەی خۆی ناناسیتەوە ..!!**

**لە ( أمامی النووی ) دەلیت: ئاوەکی : دوو دڵ و رارایە سەر لی شیواوە ،نازانیت خۆی بە کام لا دا یان شوین کەوتوو ی کامە لا بیت ، شیواو واتە: رارا دوو دل لە رۆیشتن دا ..!! .[٤٢]**

---

[٣٩] - سورة النساء (١٤٣).
[٤٠] - الطبري في جامع البيان (٣٣٢/٩).
[٤١] - صحيح مسلم برقم (٢٧٨٤) .
[٤٢] شرح النووي على مسلم (١٢٨/١٧).

## (١٢)- فيل و ته له كه بازى له گه‌ل ئيماندران دا :

**قال الله تعالى : ﴿يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَمَا يَخْدَعُونَ إِلاَّ أَنفُسَهُم وَمَا يَشْعُرُونَ﴾.[٤٣]**

واتا :ئه‌وانه به خه‌يالى خۆيان وا ده زانن خوا و ئه‌و كه‌سانه ده‌خه‌له‌تينن كه ئيماندارى راسته قينه‌ن..!! كه چى جگه له خۆيان كه‌سيان پى هه‌ل ناخه‌له تينرى ، به‌لام هه‌ست ناكه‌ن و تيناگه‌ن و بيرناكه‌نه‌وه يان بيرو هۆشيان نيه ..!!

دوو روو فيل و ته‌له كه‌ى له گه‌ل خوا و ئيماندران دا ، ته‌نها به نيشاندانى زمانى و ووته‌ى خۆى به ديار ده خات دووپاتى ده‌كاته‌وه كه ئيمانداره ، به‌لام له (دلّ ) ده‌روونى دا راست نيه و ته‌واو پيچه‌وانيه ، (دلّ ) پر له شك و گومان و درۆكردن ..!! بۆ ئه‌وه‌ى له خۆى دا دوور بخاته‌وه كه به‌و شتانه‌ى كه به زمان ده‌رى ده‌بيت واده‌زانى ئه‌وا حوكمى خو دايه ..!! پيويست به‌هه‌مان شيوه بارودۆخى له درۆزنه‌كان بيت ، ئه‌گه‌ر به زمانى ده‌رنه‌كه‌ويت كه خۆى دوو پات بكاته‌وه‌بۆ دوو رووى ،ئه‌وا به كوشتن و خرا په كارى خۆى ديار ده‌خات ، ئه‌وه فيل كردنه له خوا و وه له ئه‌هلى ئيمان به خوا ..!! .[٤٤]

---

[٤٣] - سورة البقرة (٩).
[٤٤] - ابطبري في جامع البيان (٢٧٢/١).

## (١٣) – دادوه ری به له سنوور دەرچووان ده كەن (التحاكم إلى الطاغوت):

**قال الله تعالى :**﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَنْ يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا إِلَى مَا أَنْزَلَ اللَّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ رَأَيْتَ الْمُنَافِقِينَ يَصُدُّونَ عَنْكَ صُدُودًا﴾ .[٤٥]

**واتا : ئايا سەرنجت نەداوە یان نەترواتیوتە ئە (دوو رووانەی) فیز و لافی ئەوە لی دەدەن گوایە بەراستی ئیمانیان یان باوەڕیان هیناوە بەوەی كە بۆ تۆ رە وانە كراوە و بەوەش كە پیش تۆ رەوانەكراوە (بۆ پیغەمبەران) ..؟؟ كەچی دەیانەویت روو بكەن (طاغوت) واتە : (لە سنوور دەرچوان وە زۆر دارو ستەمكاران و جادوو گەرو خوا نەناسان) تاكو دادوەریان لە نیواندا بكەن وە چارەسەری كیشە كانیان بكەن ، لە كاتیك دا بەراستی فەرمانیان پیدراوە كە باوەڕیان بە (طاغوت) نەبیت ، شەیتانیش دەیەویت گومرایان بكات بە گومرایەكی زۆر دوور و بی سنوور ..؟؟ كاتیكیش پییان دەووتریت : وەرن بۆلای ئەو (قورئانە) كە خوای گەورە ناردوویەتی یە خوارەوە بۆ لای پیغەمبەرەكەی ﷺ (بۆ چارەسەری كیشەكانتان) كەچی دەبینی (منافق) یان (دوو رووە كان) پشتت تیدە كەن و رووت لی وەردەگیرن بە تەواوی ..؟؟**

**لە (ابن القیم)- رەحمەتی خوا لی بیت – دەلیت : (ئەگەر بیان گیریتەوە بۆ سەر وە حی و نیگای خوای گەورە ،ئەوا رۆشن دەبینی لی هەلدین یان لی رادە كەن ..؟؟ وە ئەگەر بانگیان بكەی بۆ سەر دادوەری قورئان و سونەتی پیغەمبەری خوا ﷺ دەیان بینی وە پشتی لی هەلدە كەن ، وە ئەگەر راستی و حەقیقەتیان پیشان بدەی یان سەرنج بدەی دە بینی لە نیوان هیدایەتدا دوور یەكی زۆر فەراوان یان بەرین بوونی هەیە ، بۆت دەردە كەویت راستی حەقیقەتیان پشت لە وەحی نیگای خوای گەورە یە ، چونكە پشت تی كردنیكی توند فەروان و بەرینە ..؟؟.**[٤٦]

---

[٤٥] - سورة النساء (٦٠-٦١).
[٤٦] - ابن القيم مدارج السالكين (٣٥٣/١ ).

( ١٤ )- بلاو بوونەوەی گەندەلی و فتنەو ئاشووب خراپە کاری لە نیوان موسلمانانندا :

**قــال الله تعــالى :** ﴿لَوْ خَرَجُوا فِيكُمْ مَا زَادُوكُمْ إِلَّا خَبَالًا وَلَأَوْضَعُوا خِلَالَكُمْ يَبْغُونَكُمُ الْفِتْنَةَ وَفِيكُمْ سَمَّاعُونَ لَهُمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ﴾.[٤٧]

واتا: ئەوانە ئەگەر دەرچووناية و لە ناو تاندا بووناية هيچيان بۆ ئيوە زياد نەدە كرد بيجگە لە سستی تەمەلی نەبيت ،لە( ئاشووب فتنە ) گيرە شيوينی زياتريان لەدەست نەدەهات ،و دەستيان دە كرد بە بۆرە بۆرو چرپە چرپ لە ناو تاندا وە دە گەران بۆ دۆزينەوەی كۆنيك يان كەلينيك ، بە ئاواتی ( ئاشووب فيتنە ) هەلگيرساند ئاگر خۆش كردن لە نيواتاندا ، كە سانيكيش هەن لە ناو ئيوە دا ، گوييان بۆ دە گرن ،خوايش چاك ئاگادارە بە كارو كردەوەی ستەمكارن ..!!

خوای گەورە دەفەرمووێت : ﴿لَوْ خَرَجُوا فِيكُمْ مَا زَادُوكُمْ إِلَّا خَبَالًا﴾ واتا: ئەگەر لە گەل ئيوەش بهاتناية يان درچوو بوونياية بۆ غەزاو كوشتاری كافران ئەو ئيش كارە كەيان لە ئيوە تيك دەدا ، واتە: ئەوانە ترسنۆكن هەلدە هاتن رايان دە كرد خەلكيشيان لە ئيوە پەشيمان دە كردنەوە..!! ﴿ وَلَأَوْضَعُوا خِلَالَكُمْ يَبْغُونَكُمُ الْفِتْنَةَ﴾ كيشە يان بۆ دەنانەوە و فتنە و ئاشووب ئاژاوەيان بە پا دە كرد ، دەستيان دەكرد بە قسە هينان وبردن و قينە رەق و دوو بەركيان بەرپا دە كرد لە نيوان تاندا ..!! ﴿وَفِيكُمْ سَمَّاعُونَ لَهُمْ﴾ هەندكيشتان لە ناودا بوو قسەكانيان لی دەبيستن ،واتە: هەندی كەستان تيا بوو كە گويرايەليان بوون ، قسەی ئەو ( دوو رووانە ) يان بەچاك دەزانی و لەقسەيان دەرنە دەچوون چونكە ئەوانە نەياندەزانی كە ئەوانە ( دوو روون ) لەبەر ئەو لە ناو موسلمانانندا كيشەو دوو بەركی فتنە ئاشووب و خرپەی زۆر رووی ئەدا ..!! پاشان خوای گەورە باسی ئەوەدە كات كە خۆی باش دەيناسێ ئەفەرمووێت ﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ﴾ واتە : خوای گەورە ئاگادرا زولمی ستەمكاران و لە سنوور دەچووان خوا نە ناسان ..!!.[٤٨]

---

[٤٧] - سورة التوبة (٤٧).
[٤٨] - ابن كثير في تفسير القران العظيم (١٦٠/٤).

## ( ١٥ )- سويند خواردن به درۆ وه وه ترس ولەرزو شلە ژانی ترسنۆكی :

**قال الله تعالى :** ﴿وَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ إِنَّهُمْ لَمِنْكُمْ وَمَا هُمْ مِنْكُمْ وَلَكِنَّهُمْ قَوْمٌ يَفْرَقُونَ (٥٦) لَوْ يَجِدُونَ مَلْجَأً أَوْ مَغَارَاتٍ أَوْ مُدَّخَلًا لَوَلَّوْا إِلَيْهِ وَهُمْ يَجْمَحُونَ﴾ .[٤٩]

واتا : ئەوانە سوینیدیش بە خوا دە خۆن كە براستی لەئیوەن ، بەلام درۆ دەكەن ، ئەوانە هیچ كاتیك لە ئیوە نین ، بەلكو ئەوانە كەسانیكن كە لە ترسان خەریكن زیرە بكە و ترسنۆكن ..!!

خوای گەورە پیغەمبەرەكەی ﷺ ئاگادار دەكاتەوە لە ترس و لەرز و شلەژانی دوو رووە كان ئەفەرموویت ﴿وَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ إِنَّهُمْ لَمِنْكُمْ وَمَا هُمْ مِنْكُمْ وَلَكِنَّهُمْ قَوْمٌ يَفْرَقُونَ﴾ بە سویندووە رەش دەبنەوە دەلین : ئیمە لە خۆتانین یان لە گەل ئیوەین ، درۆش دەكەن لەئیوە نین ، بەلام ئەوانە كەسانیكی ترسنۆكن ،ئەو ترسنۆكیە وایان لی دەكان كە سویند بخۆن هەروەها خوای گەورە دەفەرموویت : ﴿لَوْ يَجِدُونَ مَلْجَأً أَوْ مَغَارَاتٍ أَوْ مُدَّخَلًا لَوَلَّوْا إِلَيْهِ وَهُمْ يَجْمَحُونَ﴾ ئەگەر شوینیك دەست كەویت خۆیانی تیدا بشارنەوە وە تیایدا بژین یان بە ناگەیە یان ئەشكەوتی لە كیوە كاندا یان كونیك یان تونیلیك ،﴿ لَوَلَّوْا إِلَيْهِ وَهُمْ يَجْمَحُونَ﴾ زۆر بە پەلە بۆی دەچن ،( ابن عباس ، قتادە ، موجاهید ) دەلین : ئە گەر یەكی لە و سیانەیان دەست كەوتایە بە پەلە لیتان دوور دەكەوتنەوە چونكە بە ناچاری تیكە لاویتان دەكەن ، لەبە ر خۆشەویستیان نیە بۆتان خوا زیارن تیكە لاویان نە كردنایە ، بەلام ناچاری وای لیكردن ، بۆیە بەردەوام لە خەم وخەفەت دان و هەمیشە دلگرانن ،چونكە ئیسلام و موسلمانان بەردەوام لەسەركەوتنداان و بەرەو دەستەلات دەراوا بەرز دەبیتەوە بۆیە هەر كاتی موسلمانان لە خۆشیدا بن ئەوان پی یان ناخۆشە دلگرانن ، حەز دەكەن تیكەلاوی خاون ئیمان و باوەران

[٤٩] - سورة التبوة (٥٦-٥٧).

**نەكەن ، هەر لەبەر ئەم خوای گەورە دەفەرموویت :** ﴿لَوْ يَجِدُونَ مَلْجَأً أَوْ مَغَارَاتٍ أَوْ مُدَّخَلًا لَوَلَّوْا إِلَيْهِ وَهُمْ يَجْمَحُونَ﴾. [٥٠]

**خوای گەورە دەفەرموویت :** ﴿وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ وَإِنْ يَقُولُوا تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُسَنَّدَةٌ يَحْسَبُونَ كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْ هُمُ الْعَدُوُّ فَاحْذَرْهُمْ قَاتَلَهُمُ اللَّهُ أَنَّى يُؤْفَكُونَ﴾ . [٥١]

**لە( ابن القيم ) – ڕەحمەتی خوا لی بیت – دەلیت : ( جوانترین لاشە و دەستەیان هەیە ، وە شرینترین زمان و ڕوانترین بەیان ، یان ڕەوان بیژیان هەیە ، بەلان پیسترین ( دڵ ) و ریشە هەلكەنراوە وپالی بە دیواریكە وە داوە تاكو پیادە ڕەوان پی پیانەنین ..!! وە نویژە كانیان دوا دە خەن و لە كاتی خۆی دا ئە نجامی نادەن ،بەیانی لە كاتی هەلهاتنی ڕۆژ دا، وە نویژی ( عەسر ) و ڕۆژئاوا بوون واتا نویژی ( مغريب ) ، دەنووك بە زەویدا دەدەن وە ك قەلە ڕەش ، وە نویژە كانیان نویژی جستە و لاشەیە ، نەك نویژی كردەوەی ( دڵ ) وە نویژی بە كۆمەل ناكەن ، بەلكو ئەگەر یەكیكیان نویژی كرد یان لە مالەوە یان لە شوینی كارە كانیان ئە نجامی دەدە ..!! .** [٥٢]

---

[٥٠] - ابن كثير تفسير القران العظيم (٤/١٦٠).
[٥١] - سورة المنافقون (٤).
[٥٢] - ابن القيم مدارج السالكين (١/٣٥٤).

( ١٦ )- حەزیان دە كرد مدح ستایش و سوپاس بكرین كە بە شتیك هەر گیز ئە نجامیان نەداوە :

**قــال الله تعــالى :** ﴿لَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَا أَتَوْا وَيُحِبُّونَ أَنْ يُحْمَدُوا بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا فَلَا تَحْسَبَنَّهُمْ بِمَفَازَةٍ مِنَ الْعَذَابِ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ .[٥٣]

**واتا : وا گومان مەبە ن بەوانەی ( دڵ ) خۆشن بەوەی كە هەیانەو حەز دەكەن باس بكرین ، و خەلكی سوپاسیان بكات لەسەر كارو چاكە یەك كە نەیان كردووە ، ئەوە هەرگیز وامەزانە لە دەست سزا رزگاریان دەبیت ،بەلكو سزایەكی بە ئیش چاوەرییانە ..!!**

**عن ( ابی سعید خدری )** رضي الله عنه **قال :** ( أنَّ رِجَالًا مِنَ المُنَافِقِينَ علَى عَهْدِ رَسولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ كانَ إذَا خَرَجَ رَسولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ إلى الغَزْوِ تَخَلَّفُوا عنْه، وفَرِحُوا بمَقْعَدِهِمْ خِلَافَ رَسولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ، فَإِذَا قَدِمَ رَسولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ اعْتَذَرُوا إلَيْهِ، وحَلَفُوا وأَحَبُّوا أنْ يُحْمَدُوا بما لَمْ يَفْعَلُوا، فَنَزَلَتْ: ( لَا يَحْسِبَنَّ الَّذِينَ يَفْرَحُونَ بما أتَوْا ويُحِبُّونَ أنْ يُحْمَدُوا بما لَمْ يَفْعَلُوا ) الآيَةَ ) .[٥٤]

**واته : لە ( ابو سعید خدری ) - خوالی رازی بیت دەلیت :لە سەردەمی پیغەمبەری خوا ﷺ چەند پیاویك هەبوون ، ناپاك و دوو روو و مناڤق بوون ، كاتی پیغەمبەری خوا ﷺ دەچووە بۆ غەزا،ئەوان بە فیل و تەلەكەخۆیان دە دزیەوە وە لەماڵەوە دەمانەوە ،بە پیچەوانە ی پیغەمبەری خوا ﷺ بۆ دژایەتی ئەو هەلویستە نامەردانەیان ( دڵ ) خۆش دە بوون ، بە شكست هینانی موسلمانان ، بەلام كاتیك كە پیغەمبەری خوا ﷺ دە گەرایەوە لە غەزا دەچووننە خزمەتی بە هاناو درۆیان دە هینایەوە و ،سویندیان لەسەر دە خوارد حە زیان دە كرد كە شتیك نایان كردووە سوپاس و بناسرین ..!! ئیتر بەو بۆ نەیەوە ئەم ئایەتە پیرۆزە هاتە خوارە وە** ﴿لَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَا أَتَوْا وَيُحِبُّونَ أَنْ يُحْمَدُوا بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا فَلَا تَحْسَبَنَّهُمْ بِمَفَازَةٍ مِنَ الْعَذَابِ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾.

---
[٥٣] - سورة ال عمران (١٨٨).
[٥٤] صحيح البخاري برقم (٤٥٦٨).

## (١٧)-عەیبدار کردنی کردەوە چاکە کانی پێغەمبەری خوا ﷺ وە موسلمانان :

**قال الله تعالى :** ﴿وَمِنْهُمْ مَنْ يَلْمِزُكَ فِي الصَّدَقَاتِ فَإِنْ أُعْطُوا مِنْهَا رَضُوا وَإِنْ لَمْ يُعْطَوْا مِنْهَا إِذَا هُمْ يَسْخَطُونَ﴾.[٥٥]

**واتا : هەیانە تانەو تەشەنە عیب عار لە تۆ دەدات لە دابەشکردنی (زەکات) و (غەنیمەت) دەستکەوتدا ، پرو پاگەندە دەکات گوایە داد پەروەری تیدا نیە ، جا ئەوان گەر بەشیان بدریت رازین ، ئەگەر بی بەش بکرین ، ئەوا خیرا ئەوان رق هەلدەگرن و قینە لە سینە یان دە گرن ..!!**

**خوای گەورە دەفەرموویت :** ﴿وَمِنْهُمْ مَنْ يَلْمِزُكَ فِي الصَّدَقَاتِ﴾ **هەندیك لە دوو رووە کان رەحنەت لـی دە گـرن یان کردەوە کانت عەیبدار دە کەن ، لە دابەش کردنی (صەدقە) تاوانبارەت دەکەن ، با چـاك بـزانن کـە خۆیان تـاوانبارن ،چونکە ئەوان لە بەر رەزامەندی (خوای گەورە) ئەو رەخنەیە ناگرن ،بەلکو لە بـەر دوو رووبی و نا پاکی خۆیانە ،هەر بۆیە خوای گەورە دەفـەرموویت :** ﴿فَإِنْ أُعْطُوا مِنْهَا رَضُوا وَإِنْ لَمْ يُعْطَوْا مِنْهَا إِذَا هُمْ يَسْخَطُونَ﴾ **ئەگەر بەشیان درا ، ئەوا رازی دەبن ،ئە گەریش بەشیان نەدروا ئەوا تووړە دەبن و بۆلە بۆل و پرت پرت دەکەن ،واتە : لەبەرخاتری خۆیان تووړە دە بن نەوەك لە بەر خاتری خوای گەورە ..!! .**[٥٦]

**وە خوای گەورە دەفەرموویت :** ﴿الَّذِينَ يَلْمِزُونَ الْمُطَّوِّعِينَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ فِي الصَّدَقَاتِ وَالَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهْدَهُمْ فَيَسْخَرُونَ مِنْهُمْ سَخِرَ اللَّهُ مِنْهُمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾.[٥٧]

**واتا : ئەوەبی بـاوەران رەخەن و پەلارو تـانەو تەشەنە دەگرنە ئەو ئیماندارانەی کـە زیـادە بەخشن لـە خیرو کردنیاندا ، بەویستی خۆیان لەریگەی خوا دا وە پەلاریش لە ئیماندارانی هەژاران دە گرن کە بیجگە لە رەنجی شانی خۆیان هیچی تریان دەست ناکەویت ، ئینجا هەر گالتە شیان پیدەکەن ،ئـەوان خـوا تۆلەیان لی دەسینیت و ریسوایان دەکات ، بە هۆی ئەو گالتەو کردنەیانەوە و سزای بەئیش و ئازاریش بە شیانە ..!!**

---

٥٥ - سورة التوبة (٥٨).
٥٦ - ابن كثير في تفسير القران العظيم (١٨٢/٢).
٥٧ - سورة التوبة (٧٩).

عن ( ابی مسعودعقبة بن عمر ) رضي الله عنه قال: (( لَمَّا أُمِرْنا بالصَّدَقَةِ كُنَّا نَتحامَلُ، فَجاءَ أبو عَقيلٍ بِنِصْفِ صاعٍ، وجاءَ إنْسانٌ بأَكْثَرَ منه، فقالَ المُنافِقُونَ: إنَّ اللَّهَ لَغَنِيٌّ عن صَدَقَةِ هذا، وما فَعَلَ هذا الآخَرُ إلَّا رِئاءً، فَنَزَلَتْ: ﴿الَّذِينَ يَلْمِزُونَ الْمُطَّوِّعِينَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ فِي الصَّدَقَاتِ وَالَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهْدَهُمْ﴾ التوبة: ٧٩ الآيَةَ.. !! .[58]

واته : له( ابی مسعودی عەقبەی کوری عمر ) – خوالی رازی بیت – دەلیت :کاتیك فەرمان کرا کە خیرو چاکەو صدقه بکەین بە یکتری دا ، ئیمه خیرو صدقه مان بە کۆل لە پشتمان دەهینا ، پیاوی هات شتیکی زۆری بەخشی _دوو رووەکان ) ووتیان : ئەم نمایشکردن یان ( ریائە ) پاشان پیاویك هات مەنیك یان کەمیك صەدقه و خیر هینا ، ئەوا دوو رووە کان ووتیان : خوای گەورە بی نیازە لە صەدەقە ی ئەوە ..!! لەو کاتەدا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە کە خوای گەورە دەفەرموویت : ﴿الَّذِينَ يَلْمِزُونَ الْمُطَّوِّعِينَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ فِي الصَّدَقَاتِ وَالَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهْدَهُمْ﴾ ..!! ).

( ئەمەش یەکیکی تر لە رەوشتە ناشرینەکانی ( دوو رووە کان ) کە هیچ کەسی لە تانەو تاشەنەو عەییدار کردنی ئەوانە دەرناچیت ،لە هەموو کارو کردەوەیە هەتاکو عەییدار کردنی بەخشینی ( زەکات ) و ( صدقه )ش ، هەتاکو ئەوانیە کە مال وخیرو چاکەی یان صدقەی زیاتر دەکەن یان دەبەخشن ،هەر لە دەست زمانی ئەوانە دەربازی نابیت ، ئەگەر کەسیکیش مالیکی چاك و زۆری هینابی ،ئەوە دەلین : ئەو کە سە ( ریاء) کارە یان خۆی نمایش دەکات ، ئەگەر کەسیکی تریش مالیکی کەمی هینا بیت هەر ئەوەندەی لە توانا دابیت ، ئەوا ( دوو رووە کان ) دەلین : خوا بی نیازە لە صدەقەی ئەمە ..!! ).[59]

---

[58] صحيح البخاري برقم (٤٦٦٨).
[59] ابن كثير في تفسير القران العظيم (١٨٤/٤).

**( ١٨ ) رازی بوون بەو سەر شۆریە ی لەدواوەی موسلمانان بن تەنها غەزا نەکەن بچنە شوینك لەگەل لە ناو ژن و مندلان و بەسالاچوان بن :**

**قال الله تعالى :** ﴿وَإِذَا أُنْزِلَتْ سُورَةٌ أَنْ آمِنُوا بِاللَّهِ وَجَاهِدُوا مَعَ رَسُولِهِ اسْتَأْذَنَكَ أُولُو الطَّوْلِ مِنْهُمْ وَقَالُوا ذَرْنَا نَكُنْ مَعَ الْقَاعِدِينَ﴾ .[٦٠] **واتا : کاتیکش سورەتیك لە قورئان دابە زینریت و ( داوایان لی بکات ) کە ئیمان بە خوای گەورە بهینن وە لە گەل پیغەمبەرە کەیان جیهاد و تی کۆشان بکەن وە بچن بۆ غەزا ، ئەو دەسەلات دارو سەرمایە دارە کانیان یان ( دوو رووە کان ) مۆلەتی لی دە خوازن و دەلین : وازمان لی بینە تا لەگەل بە سالاچوو پە کەوتەکاندا بین ..!!**

**خوای گەورە نارە زای خۆی دەردەبریت لینا واتە سەرزەنشتی ئەو کەسانەدەکات کە خۆیان لە جیهاد غەزا کردن دەدزنەوە گویی بە فەرمانەکانی پیغەمبەرە کەیان ﷺ نادەن برۆن بۆ غەزا ، لە کاتیك دا تونای جیهاد و غەزا کردنیان هەبوو ، کە خاوەنی دەسەلات وسامانیش بوون کە چی دوای مۆلە تیان دە کرد لە پیغەمبەر ﷺ کە لەدواوە دا بمینەوە و دەرنەچن کە خوای گەورە دەفەروویت :** ﴿وَإِذَا أُنْزِلَتْ سُورَةٌ أَنْ آمِنُوا بِاللَّهِ وَجَاهِدُوا مَعَ رَسُولِهِ اسْتَأْذَنَكَ أُولُو الطَّوْلِ مِنْهُمْ وَقَالُوا ذَرْنَا نَكُنْ مَعَ الْقَاعِدِينَ﴾. **کاتیك ئەم سورەتە دیت خوارە وە کە باورە بهینن ، لەگەل پیغەمبەرە کەیان بچن بۆ غەزا ، خاوەن دەسەلاتە کانیان دین مۆلەت لە تۆ دە خوازن و دەلین : واز لە ئیمە بینە ،با ئیمەش لە مال بمینین وەك ئەوانەی لە مال دانیشتوون ، ئەوانە رازی بوون بەم سەر شۆریە ی خۆیاندا بین لە ناو ژن و مندالان وبەسالاچوان دا نیشن بمینەوە دەرنەچن بۆ جیهاد کردن ، ئەوانەکاتیك کە شەرو چەنگ روودە دات ترسنۆك ترین کەسن بەلام لەکاتی ئاشتی ئارامی دا لە هەموو کەسی لە پیشترن قەسە کەر ترن ..!! . وەك خوای گەورە دەفەرمووی: لە ئایەتەدا**﴿أَشِحَّةً عَلَيْكُمْ فَإِذَا جَاءَ الْخَوْفُ رَأَيْتَهُمْ يَنْظُرُونَ إِلَيْكَ تَدُورُ أَعْيُنُهُمْ كَالَّذِي يُغْشَى عَلَيْهِ مِنَ الْمَوْتِ فَإِذَا ذَهَبَ الْخَوْفُ سَلَقُوكُمْ بِأَلْسِنَةٍ حِدَادٍ أَشِحَّةً عَلَى الْخَيْرِ أُولَئِكَ لَمْ يُؤْمِنُوا فَأَحْبَطَ اللَّهُ أَعْمَالَهُمْ وَكَانَ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرًا﴾.[٦١] **لە کاتی هیمنی و ئارامی ئاسایش دا ئەوان ( دوو رووەکان )قەسەکەری باشن خۆیان بەدەردەخەن ، بەلام لە کاتی چەنگ و شەرو شۆ دا ئەوان ، جباترین و ترسنۆك ترین کەسن لە هەموو سەر زەوویە دا ..!؟ .**[٦٢]

[٦٠] - سورة التوبة (٨٦).
[٦١] - سورة الاحزاب (١٩) .

[٦٢] - ابن كثير في تفسير القران العظيم (١٩٦/٤).

## ( ١٩ ) فەرمان كردن بە خراپە كارى ..؟! وە قەدە غەكردن لە چاكە كارى ..؟!

**قـــال الله تعـــالى :** ﴿الْمُنَافِقُونَ وَالْمُنَافِقَاتُ بَعْضُهُمْ مِنْ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمُنْكَرِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمَعْرُوفِ وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْ نَسُوا اللَّهَ فَنَسِيَهُمْ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾. [٦٣] **واتا :( دوو رووە كان ) لە پیاوان و لە ژنان سەر بە كترن و وەك یەكن لم رەفتاانـەدا ، فەرمان بە تاوان و گوناهو خراپە دەدەن ، وە قەدەغەی خیرو چاكە دەكەن ،و دەستیان دەنووقینن ، مال و سامانیان بەشی كە س نادەن ، ئەوانە خوا یان فەرمۆش كردووە ، خوایش ئەوانی پشت گـویی خســتووە ، بەراستی ( دوو رووەكان ) هەر خۆیان یاخی و لە سنوو ر دەرچوو و یان ئاین دەرچوون ..!!**

**خوای گەورە دەفەرموویت : پیاوان و ژنان لە ( دوو رووانە ) وە ك یەكن فەرمان بە خراپە دەكەن ، قەدەغـە لە لە چاكە كردن دەكەن ، دەستی خۆشیان لە خیرو چاكە دەچوقینن ،واتە : لە مال بەخشین لـەری خـوا دا** ﴿نَسُوا اللَّهَ فَنَسِيَهُمْ﴾ **خوای گەورە یان لە بیر كردووە یادی خوا ناكەن ، خوای گەورە ش ئەوانی لە بیر كردووە ،بەم شیوەیە مامەلەیان لە گـەل دا دەكـات ، وەك ئـەم ئایەتـە ئەفـەرموویت :** ﴿وَقِيلَ الْيَوْمَ نَنْسَاكُمْ كَمَا نَسِيتُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَذَا﴾. [٦٤] **واتە : پییان دەووتریت : لەم رۆژا بەدواوە ئیتر ئیـوە فەرمۆش دەكەین وە پشت گویتان دەخەین ، هەر وەك چۆن ئیوە بروا بوونتان بەم رۆژە فەرمۆش كرد ..؟!**

**خـوای گـەورە دەفـەرموویت :** ﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ **واتــە : ( دوو رووە كـتن ) دەرچـوونە لەریگای حەق راستی ، چوونەتە سەریگایە ناراست نادروست تاریكی ..!!** .[٦٥]

---

[٦٣] - سورة التوبة (٦٧).
[٦٤] -سورة الجاثية (٣٤).
[٦٥] - ابن كثير في تفسير القران العظيم (١٧٣/٤).

**( ٢٠ ) ڕەقیان لە جیهادو تێ کۆشانە ،( دڵ ) یان خۆشە بە دانیشتنیان لەدواوە نەچوونیان :**

**قال الله تعالى :** ﴿فَرِحَ الْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلَافَ رَسُولِ اللَّهِ وَكَرِهُوا أَنْ يُجَاهِدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَقَالُوا لَا تَنْفِرُوا فِي الْحَرِّ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا لَوْ كَانُوا يَفْقَهُونَ﴾ .[٦٦] **واتا : ( دوو ڕووە کان ) ئەوانەی کە لە دواوە مانەوە لە ناو شاری مەدینە شادمان بوون بە دانیشتنیان و دوا کەوتنیان لە گەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دا نەچوونیان بۆ جیهاد و تێ کۆشـان ، وە حەزاین نەکرد جیهاد و تێ کۆشان بکەن و بە ئیماندارانیان ووت : لەم گەرمایە دا دەر بەچن بۆ جیهـاد ،ئەی ﷺ پێیان بڵی : ئاگری دۆزەخ بەتیر و بەهێزترە لـە گەرمیـدا ئەگـەر تـێ بگـەن و بـیرو هۆشـیان بەخەنە کار ..!!**

**( خوای گەورە ) سەرزەنشتی ( دوو ڕووەکان ) و ئەوانـەی دوا کـەوتوون لـە غـەزای ( تبـووك ) دا لـە گـەڵ پێغەمبەری خوا و ﷺ هاوەڵانی دا ، وە ( دوو ڕووە کان ) دوا کەوتووە کان ( دڵ )ی ان خـۆش بـوو بـەوەی کەلەماڵەوە دانیشتبوون نەچوونە بۆ جیهاد کردن لە غەزای ( تبووك ) ،ئەوە بوو بە هـاوە ڵان و یـەکتریان دە ووتن : مەچنە دەرەوە بۆ جیهاد کردن لە ( غەزای تبوو ك ) لەم گەرمایەدا..؟! چونکە ڕۆیشت بۆ ( غەزای تبوو ك ) لە کاتێکی زۆر گەرمدا بوو سێبەر زۆر خۆش بوو ،بەروو بوومیش پێ گەیشتبوو . بۆیە ووتیـان :** ﴿لَا تَنْفِرُوا فِي الْحَرِّ﴾ **واتـە : مەچـەن دەرەوە بـەم گەرمایـە ..؟! خـوای گـەورە ش فـەرمووی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ :** ﴿قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا لَوْ كَانُوا يَفْقَهُونَ﴾ **بڵی : ئەگەر تێگەیشتنتان هەبوایە ،خۆ ئـاگری دۆزەخ زۆر گـەرمترە ،واتـە : ئـەو ئـاگرەی دۆزە کـە خۆتـان لا دەدەن لەسـەری لـە گەرمادەرناچن خۆتان لادەدن ،زۆر گەرمترە لە ئاگری دونیا دا ..؟! .**[٦٧]

---

[٦٦] -سورة التوبة (٨١).
[٦٧] - ابن كثير في تفسير القرآن العظيم (١٨٩/٤).

( ٢١ )- بی ئومیدو بی هیواو له سەرکەوتن بەهۆی ( دڵ )ە لەرزۆ کەکانیان :

**قـــال الله تعـــالى :** ﴿وَإِذْ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ مَا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ إِلَّا غُرُورًا (١٢) وَإِذْ قَالَتْ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ يَا أَهْلَ يَثْرِبَ لَا مُقَامَ لَكُمْ فَارْجِعُوا وَيَسْتَأْذِنُ فَرِيقٌ مِنْهُمُ النَّبِيَّ يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ وَمَا هِيَ بِعَوْرَةٍ إِنْ يُرِيدُونَ إِلَّا فِرَارًا﴾.[٦٨]

**واتـا : کاتیکیش ( دوو رووەکان ) ئەوانەی ( دڵ ) نەخۆشی گومانی تیدابوو دەیانـەووت : خـوا و پیغەمبەرەکەی تەنها بۆ خەلەتاندن بوو ، هیچی تر نەبوو ..؟!کـاتیکیش هەنـدیك لـە( دوو رووەکان ) ووتیان : ئەی خ لکەی ( یثـرب ) واتە : شاری مەدینە ..!! ئەمەهیچ شوینی ئیوە نیە بگەرینەوە ناوشاری مەدینـە ، دەســتەیەکیش لـەوان مۆلـەتیان لـە پیغەمبـەری خـوا ﷺ دەخواست وە دەیان ووت : مالە کانمان بەدەرەوەیە ..!! گوایە دوژمن بـە ئاسـانی دەتوانیـت هەلکەوتیتە سەری ، لە راستیدا وانیە مالە کانیان بەدەرەوەنین ،دوژمن ناتوانیـت زفـەریان پیبەریت ،تەنها راکردنیان مەبەستە و هیچی تر نا ..!!**

---

[٦٨] - سورة الاحزاب (١٢-١٣).

## ( ٢٢ ) لەکارەکانیان سستی دەکەن خۆیان دە دزنەوە لە گەل ئیماندااران :

**قال الله تعالى :** ﴿وَإِنَّ مِنكُمْ لَمَن لَّيُبَطِّئَنَّ فَإِنْ أَصَابَتْكُم مُّصِيبَةٌ قَالَ قَدْ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيَّ إِذْ لَمْ أَكُن مَّعَهُمْ شَهِيدًا﴾ .[٦٩] **واتا : سویند بیت ( دەستەیك لە دوو روو هەن ) لە ناوتاندا بەراستی خۆیان دەخلافینن و سستی دەکەن ، جا ئەگەر بەلایەکتان تووش بیت ،هەریەك لەوانە دەلیت : بەرستی خوا چاکی بۆ کردم کە لە گە ل ئەواندا ئامادە ی جەنگ نەبووم ..!!**

**ئەوە ئەو ناو سیفەتەیە یان ئەو ناوەیە کە خوای گەورە لە دوو رووە کانی ناوە ، هەروەها ئەو سیفەتانەی کەبۆ پیغەمبەری خوا ﷺ و هاوەلانی وسفی کردوون بە سیفە تەکانی دوو رووە کان ﴿وَإِنَّ مِنكُمْ﴾ ئەی ئیمانداران مانایی ئەوەیە کە( دوژمنان کە لەخۆتانن ) هەر وەك ئیوە خۆیان نیشاندەدن ،وا خۆیان نیشاندەدن کە ئەهلی بانگەوازی ئاینەکە دەکەن و لە ئیماندرانن واتە ئیسلامن ..!! ئەوانە دوو رووکانن زۆر سستی دەکەن لەکارە کانیان خۆ دەدزنەوە لە پشتوانی ئیوە لە جیهاد کردن بە رامنبەر دوژمانان ..!! ئەگەر هاوەلیکتان لی شەهید بوو یان کوژا .. !؟ ﴿فَإِنْ أَصَابَتْكُم مُّصِيبَةٌ﴾ ئەگەر بەلایەکتان هاتەسەر ئەوا بە کوشتن یان زمداری بیت لە لایەن دوژمنان ئەوا دەلین : ﴿قَالَ قَدْ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيَّ إِذْ لَمْ أَكُن مَّعَهُمْ شَهِيدًا﴾ واتە : خوا بەراستی خیری بۆ ئیمە هەبوو لەگەل ئەوان دا نەبووین بۆ جەنگ ئامادە نەبووین نەکوژراین ..!! بەلام ئەگەر بەلایەك هات بۆ تان زامداری بیت یان ئازارو ئیش ژان بیت یان کوشتن بیت ،ئەوان زۆر بە نیهینی و جیاواز لە ئیوە رفتار دەکەن ..!! چونکە ئەوانە واتە : دوو رووەکان ئەلە خەلکانی شك و گومانن لە ، وعد و پەیمانی خوای گەورە ،بەلام ئەوە ئیماندارە مەیلی ئەوەیە لە پیناوی خوا جیهاد بکات بەلکو ئەجر و پاداشت وەرگریت بەتەنها ،ئەوەی مەیلی بۆ پاداشت نەبیت ،ئەوەیە لە سزاو عقاب ناترسیت..!! .**[٧٠]

---

[٦٩] - سورة النساء (٧٢).
[٧٠] -الطبري في تفسير جامع البان (٥٣٨/٨).

## ( ٢٣ )- بۆ جیهاد و تیکۆشان له پیناوی خوا دا دوای ئیزن و مۆلەت دەکەن :

**قال الله تعالى :** ﴿وَمِنْهُمْ مَنْ يَقُولُ ائْذَنْ لِي وَلَا تَفْتِنِّي أَلَا فِي الْفِتْنَةِ سَقَطُوا وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌ بِالْكَافِرِينَ﴾.[٧١]

واتا : ( دوو رووەکان ) بی چاوو رووانه کە سانیك هەن دەلین : ئیز یان مۆلەتم بدەو تووشی گوناهو سەر پیچم مەکە ..!! بیانووی ئەوەی لە غەزادا ، لەوانەی تووشی کوناهو هەلەبیت ..؟! ئەو جۆرە کەسانە با چاك بزانن کە لە گوناهو تاواندا رۆچوون ، بی گومان دۆزەخیش گەرمارۆیی بی باوەرانی داوە رزگار بوونیان زۆر ئەستەمە ..؟!

وە ( دوو رووە کان دینە لەت ئەی ﷺ دەلین : ﴿ائْذَنْ لِي﴾ لە دانیشتن دا لەمالەوە دەر نەچین لە گەلدا ﴿وَلَا تَفْتِنِّي﴾ چونکە تووشی گوناهو تاوان دەبین بە، خوای گەورە دەفەرموویت : ﴿أَلَا فِي الْفِتْنَةِ سَقَطُوا﴾ با باش برازنن هەر ئیستا ئیوە کەوتوونەتە ناو گوناهو تاوانەوە بە قەسە یەی کە ئیوە کردتان ..!! .[٧٢]

---

[٧١] - سورة التوبة (٤٩) .
[٧٢] - ابن كثير في تفسير القران العظيم (١٦١/٤).

## ( ٢٤ )- پیش وختە عوزر و پاساو دە هینەوە بۆ خۆیان :

**قال الله تعالى :** ﴿يَعْتَذِرُونَ إِلَيْكُمْ إِذَا رَجَعْتُمْ إِلَيْهِمْ قُلْ لَا تَعْتَذِرُوا لَنْ نُؤْمِنَ لَكُمْ قَدْ نَبَّأَنَا اللَّهُ مِنْ أَخْبَارِكُمْ وَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَى عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَيُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ .[٧٣] **واتا : كاتیك ئیوە لە غەزا دە گەرینەوە ( دوو رووە كان ) دین بۆلاتان و دوای لی بووردنتان لی دەكەن و یان پاساو عوزریان هەیە ..!! پییان بلی : داوای لی بووردن مەكەن یان عوزر و پاساو بیانوو مەهینەوە ..!! هەرگیز باورتان پی ناكەین ..!! خوایش ئاگاداری كردووین لە هەموو هەوال و هەلس وكەوت و گوفتار نیتە كانتان ، لە كوفر بی باوەری دەمینینەوە یاخود پەشیمان دەبنەوە ..؟! پاشان دە گەرینەوە بۆ لای ئەو زاتەی كە زاناو ئاگای پەنهان و ئاشكرایە ،ئینجا ئاگادارتان دە كاتەوە بەو كارو كردەوەیەی كە دەیكەن ..!!**

**خوای گەورە هەوال بە پیغەمبەری خوا و ئیمانداران دەدات كاتیك گەرانەوەی شاری مەدینە لە غەزادا ئەوا ( دوو رووە كان ) دین عوزرو پاساو دەهینەوە و داوای لی بووردن دە كەن** ﴿قُلْ لَا تَعْتَذِرُوا لَنْ نُؤْمِنَ﴾ **كەچی راست ناكەن و درۆ دە كەن ..!!** ﴿قَدْ نَبَّأَنَا اللَّهُ مِنْ أَخْبَارِكُمْ﴾ **بەلام خوای گەورە بە حال نیەتی زاناو دانایە بە نیەتیان دە زانینت ..!!** ﴿وَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ﴾ **خوداو پیغەمبەرەكەی ﷺ كردەوە كانتان دەبینن ئەو كردەوانەی كە خەلكی دەیكەن لە ژیانی دونیادا ..!!** ﴿ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَى عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَيُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ **لە پاشان دە گەرینەوە بۆلای ئەو زاتەی كە لە ئاشكراو پەنهانیەكان ئاگادارە ..!! وە ئاگادارتان دە كات لەو كردەوانەی كە كردووتانە لە كردەوەی چاك و لە كردەوەی خراپە پاداشتان دەداتەوە لەسەری ..!! .**[٧٤]

---

[٧٣] - سورة التوبة (٩٤).
[٧٤] - ابن كثير في تفسير القرآن العظيم (٤/٢٠١).

## ( ٢٥ )-شاردنەوەی خیانەت تاوانەکانیان لە خەلکدا :

**قــال الله تعــالى :** ﴿يَسْتَخْفُونَ مِنَ النَّاسِ وَلَا يَسْتَخْفُونَ مِنَ اللَّهِ وَهُوَ مَعَهُمْ إِذْ يُبَيِّتُونَ مَا لَا يَرْضَى مِنَ الْقَوْلِ وَكَانَ اللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطًا﴾ .[٧٥] **واتا : ئەوانە دەیانەویت خیانەت و تاوانەکانیان لە خەلکی بشارنەوە ،لە کاتیکدا ناتوانن لــە خــوای گــەورە بشــارنەوە کـە لــە گەلیاندایەو چاودیریانە ، لە شەو دا قسەی وا هەلدە بەستن خوای گەورە پــی رازی نیــە و خــوای گــەورە بەردەوام گەمارۆدەری ئەو کارو کردەوانەیە کە ئە نجامی دەدەن ..!!**

**( دوو رووەکان ) ئینکاری دەکەن یان نەکۆلی دەکەن لەو شتە قیزەونانەی کە لە خەلکی دەیشــارنەوە ، لــە راستی دا ناتوانن نەکۆلی بکەن یان ئینکاری بکەن ، خۆ نا توانن لە گەل خوای گەورە دا هــیچ بشــارنەوە ،ئەمە نارەزایی دەربرینە لە دوو رووە کان کە سروشتیان وایە لە خەلکی دەشارنەوە ،تــاکو روو بــەروویان نەوەستن زەمیان نەکەن ،کەچی لە خودا ناترسن کە ئاگای لە هەموو شتە شاراوە کانیانەو ئەوەشی کە لــە ناو ( ڵ ) یان دایە..!! هەر بۆیە خوای گەورە دەفەر موویت :** ﴿وَهُوَ مَعَهُمْ إِذْ يُبَيِّتُونَ مَا لَا يَرْضَى مِنَ الْقَوْلِ وَكَانَ اللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطًا﴾ **واتە : خوای گەورە لە گەلیاندایە کاتیك کە شەوانە زۆر قسە دەکەن کە پیی رازی نیە ، هەر کاریك ئەوان دەیکەن ،دیارە خو دا ئاگای لییە ، دیارە ئەمە هەرشەیە کی تووندە لەسەریان ..!!** [٧٦]

[٧٥] -سورة النساء (١٠٨).
[٧٦] - ابن كثير في تفسير (٢/٤٠٧).

( ٢٦ )-دڵ خۆش دە بن  كە ئیمانداران زیانیان پی بگات و بەلاو نسیبەتیان بە سەر دابیت :

**قال الله تعــالى :** ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا بِطَانَةً مِنْ دُونِكُمْ لَا يَأْلُونَكُمْ خَبَالًا وَدُّوا مَا عَنِتُّمْ قَدْ بَدَتِ الْبَغْضَاءُ مِنْ أَفْوَاهِهِمْ وَمَا تُخْفِي صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ الْآيَاتِ إِنْ كُنْتُمْ تَعْقِلُونَ (١١٨) هَا أَنْتُمْ أُولَاءِ تُحِبُّونَهُمْ وَلَا يُحِبُّونَكُمْ وَتُؤْمِنُونَ بِالْكِتَابِ كُلِّهِ وَإِذَا لَقُوكُمْ قَالُوا آمَنَّا وَإِذَا خَلَوْا عَضُّوا عَلَيْكُمُ الْأَنَامِلَ مِنَ الْغَيْظِ قُلْ مُوتُوا بِغَيْظِكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ (١١٩) إِنْ تَمْسَسْكُمْ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ وَإِنْ تُصِبْكُمْ سَيِّئَةٌ يَفْرَحُوا بِهَا وَإِنْ تَصْبِرُوا وَتَتَّقُوا لَا يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْئًا إِنَّ اللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ﴾.[٧٧] **واتا : ئەوی ئەوانەی باوەڕ تان هیناوە ،بە كەسانیكی تر جگە لە خۆتان متمانە مەكەن نیهنی خۆتان لایان مەدركینن ، چونكە ئەوان كۆلنادەن لە دروست كردنی تەنگانە گیرو گرفت و نخۆشی بۆتان ،(دڵ) یان خۆشە  یان ئاوات دەخوازن بەوەی كە دوو چاری زیان كیشە و گیرگرفت و ناخۆشی بىن ..!! بە ئاشكرا رق و قینە لەدەم و دەویان دیارە ..!! ئەوەی لە(دڵ) و سینەیان دا شاردراوەتەوە زۆر گەورە ترە لەوەی كە  دەری دەخەن ، بی گومان ئیمە  نیشانەو بە لگەمان بۆ دیاری كردوون تا دۆست لە دوژمن جیابكەنەوە ئەگەر عەقل هۆشتان  بخە نەكار ..!! ئاگـاداربن ..!! ئیوە ئـەوانتان خـۆش دەویت ،بەلام ئیوەیان خۆش ناویت و باوەڕتان بە هەموو كتیبە ئاسمانیە كانیش هەیە بەلام ئەوان باوەڕیان ﷺ وە بە قورئان نیە ..!! كاتیكیش پیتان دەگەن دەلین : ئیمە ئیمانداریـن بـەلام كاتیـك بـە تـەنها دەبـن ، پەنچەی خۆیان دەگەزن ئەوەندە رق ئەستوور و داخ لە (ڵ) زۆر داران  ..!! پییان بلی : دەك بمرن لە داخا ..!! بەراستی خوا  خۆی زانایە بەوەی كەلە(ڵ) و دەروون وسینە كاندا شاردۆتەوە و چاك تان دەناسی ..!!**

**ئەگەر چاكەیەكتان تووش بوو ،یان خیریك رووی تیكـردن ئـەوان پـی دڵ گـران وغـەمبار دەبـن و پییـان ناخۆشە ،خۆ ئەگەر  بەلاو ناخۆشیە كاتان یان زیان كتان بۆ بیتە  پیش ، ئەوان پی دڵ خۆش دەبـن ،جـا ئەگەر خۆگر بن و پاریز كار بن ، پیلان و تەلەكەی ئـەوان هـیچ زیـان نیكتـان پیناگەیـە نیـت ،چـونكە بەراستی خوا دەوری پیلان و پلانیان داوە وئاگایە بەهوو كارو كردەوەو نەخشە كانیان ..!!.**

---

[٧٧]- سورة ال عمران (١١٨-١٢٠).

( خوای گەورە ) دەفەرمووی : نهی یان قەدەغەم کردووە لە سەر بەندەی ئیماندار بەوەی نهینی خۆی یان لە لای ( دوو رووە کان ) بەلیت یان متمانەی بە ( دوو رووە کان ) بکات ، چونکە کاتیك شەو دا هات چوونە سەر سەرینەکانیان ئەاو هیچ زەمیریك ویژدانیکیان نیە ئەوانە دوژمنتانن ، چونکە حەز دەکەن تووشی نارە حەتیتان کەن ، خوای گەورە قەدەغەی کردووە لە بەندەی ئیماندار کە ( دوو رووەکان ) بکەن بە دۆست هامرازی خۆیان و لە نیهینیەکانی خۆیان ئاگاداریان بکەن و ئەوەی لە( دڵ ) یاندایە دەر بارەی دوژمنە کانیان لە لای ( دوو رووە کان ) بی لین : چونکە ئەو ( دوو روانە ) بۆ هەمیشە هەولدەدن و تی دەکۆشن ك کیشەو ئاژاوە بنینەوە ، وە موسلمانان تووشی ئازارو ناخۆشی و نارەحەتی بکەن ، چونکە زۆر حەز بە ئازاردانی موسلمانان دە کەن ..!! ئەوانە لە تیکدان و ئاژاوە دا دریغی ناکەن ، چونکە حەز دەکەن نارە حەتان بکەن ، جیاوازن لەوەی کە بەدەم ئاشکرای دەکەن ، ئەوەی لە ( دڵ ) دە روونیان دایە زۆر جیاوازە و گەورەترە پرە لە رق قینە ، ئەگەر چاکەیەتان بیتە ری ئەوا زۆری خەم پی دەخۆن ، بەلام ئەگەر زیان و نارەحەتیەکتان بیتەری ئەو زۆر ( دڵ ) خۆش دەبن پی ، واتە : ( دڵ ) یان خۆشە بە هەموو ئازارو ناخۆشی نارە حەتی و زەرەرو زیانی ئیمانداران ..!! وە ئەو زیانە کە بەموسلمانان کەوت لە رۆژی غەزای ( ئوحود ) ئەیانەویت بە هەموو تاوانایەکیان فروفیل تەلە کەبازی مکرو لە گەل موسلمانان دا بکە ..!! بی گومان هەر کاتیك کە بە موسلمانان دەگەن دەلین : ئیمە ئیما نمان هیناوە ، بەلان کاتیك لیتان جیادەبنەوە یان دوور دەکەو نەوە لەو رەقەی هەیانە سەر پنچەی خۆیان دە گەزن ..!! هەر وەك خوای گەورە دە فەرموویت : ﴿قُلْ مُوتُوا بِغَيْظِكُمْ﴾ واتە : دەك لە رقان بمرن ..!! بەوەی کە پەنچەی خۆتان لە بەر حەسوودی و رق و قینە دەردەبرن لە بەر سەرکەوتنی موسلمانان ..!! خوای گەورە لە ( دڵ ) یاندا باش ئاگادارە ..!!ئەگەر موسلمانان صبر ئارام بگرن بە سەر مکرو فیل و تەلە کە کانی ( دوورووەکان ) ئەوا فیل و تەلەکەی ( دوو رووەکان ) هیچ زیان تان بیناگەیەنی ..!! چونکە پشت بەست بە خوای گەورە لە زیانی دوو رووە کان پاریزگار دەبن ، چونکە خوای گەورە ئاگای دوژمنە کانە و هیچ تواناو دەست ەلاتیکیان نیە ، بەرانبەر بە دەست هەلاتی خوای گەورە ..!! چونکە خوای گەورە بە هەموو کردەوە کانیان دەزانیت ..!![٧٨]

---

[٧٨] - ابن كثير في تفسير القران العظيم(٢/١٠٦).

**( ٢٧ )- ( دوو رووەكان ) چوار سیفاتیان هەن :**

**١-ئەگەر ئەمانە تیكیان گرتە دەست خیانەتی لیدەكەن :**

**٢-ئەگەر ئەگەر كردەوەیە كان كرد یان قسەیەكان كرد بەردەوام درۆ دەكەن :**

**٣-ئەگەر پەیمانیكیاندا غەدر دەكەن ، یان پەیمان و بەلینە یان نابەنەسەر :**

**٤-ئەگەر مەشتوومەریان كرد یان مجادلەیان كرد دەر دەچن لە سنوور :**

**قال الله تعالى :**﴿وَمِنْهُمْ مَنْ عَاهَدَ اللَّهَ لَئِنْ آتَانَا مِنْ فَضْلِهِ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ الصَّالِحِينَ (٧٥) فَلَمَّا آتَاهُمْ مِنْ فَضْلِهِ بَخِلُوا بِهِ وَتَوَلَّوْا وَهُمْ مُعْرِضُونَ (٧٦) فَأَعْقَبَهُمْ نِفَاقًا فِي قُلُوبِهِمْ إِلَى يَوْمِ يَلْقَوْنَهُ بِمَا أَخْلَفُوا اللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ﴾.[٧٩]

**واتا: لە ( دوو رووە كان ) كە سانیك هەن كە پەیمان و بەلینی بە خوا داوە :سویند بە خوا ئەگەر خوا مال و سامان و داریمان پیببە خشیت بەراستی ( زەكات ) و خیری لیدەكەین و بیگومان لە ریزی كەسانی چاك و خواناسیشدا دەبین ..!!جا كاتیك خوا لە فەزل و بەرەكەتی خۆی پیدان و بەهرەوەری كردن ، ئەوان رەزیلینان تی كردووە لە بەلینە كەیان كرد لە كاتیكدا كە ئەوان هەمیشە لە بەلین و پەیمان پشت هەلدەكەن ..!!ئەو سا ئیتر بەهۆی ئەو بەلین شكاندیانەوە ،خوا نەخۆشی ( دوو روویی ) لە ( دڵ ) و دەروونیاندا چەپساندوە دامەزراند تا ئەو رۆژەی ئامادە دەبن لەبەردەم دادگای خوای گەورە دا ،بۆ لیپرسینەوە ، چونكە نا فەرمانی و سەرپیچیان كردووە لەو پەیمانەی یان ئەو بەلینەی كە دایان بە خوای گەورە بەهۆی ئەوە شەوە كە دۆریان دە كردە ..!!.**

**خوای گەورە دەفەرموویت: واتە هەندیك لەناو ئەواندا پەیمانیان لە گەل خوای گەورە بەست ، بە و بەلینە ی ئەگەر خوای گەورە لە خیرو بەركەت و چاكەی خۆی بەشی ئەوان بدات ، ئەوا ووتیان : ئیمەش خیرو چاكە خیرات و صدەقە دەكەین لە مال وسامان رزقەی كە خوا بە ئیمەی داوە ئینجا دەچینە ریزی پیاو چاكانەوە ..!! كە چی( دوو رووە كان ) بەلین و پەیمانیان دا بە خوای گەورە ، بەلان نەیان بردە سەر پەشیمان بوونەوە لەوەی كە بەلینیان لەسەر دا بوو ،كە خیرو چاكە دەكەین بەلام ئەوان تەنها بانگەوازی بۆ دەكەن بەلینیان نەبردە سە ر پەیمانیان شكان لە گەل خوای گەورە دا ..!! هەر بۆیە بوو بەهۆی دامەزرانی ( دوو روویی ) لە ( دڵ ) دە روونیاندا تا ئەو رۆژە دیتە بەر لە بارەگای خوای گەورە دا لە رۆژی قیامەتدا ، پەنا دەگرین بە خودا لەوە ..!! .**[٨٠]

---

[٧٩] - سورة التوبة (٧٥-٧٧).
[٨٠] - ابن كثير في تفسر القران العظيم (٨٣/٤).

قال الله تعالى :﴿وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالْيَوْمِ الْآَخِرِ وَمَا هُمْ بِمُؤْمِنِينَ﴾ .[81]

واتا : له ناو خه‌لكى دا كه سانيك هه‌ن كه ده‌لين : ئيمان و باوه‌رمان به خوا و به رۆژى دوايى و يان قيامه‌ت هيناوه له‌راستيدا ئه‌وانه درۆ ده‌كه‌ن ئه‌وانه هه‌ميشه باوه‌ر دار نين يان ئيماندار نين ..!!

له( ابن القيم ) – ره‌حمه‌تى خواى لى بيت – ده‌ليت : سه‌ر چاوه‌ى هه‌موو ماله كه يان به فرو فيل و ته‌له‌كه بازى مكر نا پاكيه ، وه هه‌موو كه‌ل په‌ل و شتوو مه‌ته كانيشيان له سه‌ر درۆ كردنه ئه‌وه‌نده قيزه وون خه‌ريكه درشينه‌وه له گه‌ل درۆ كردن ،ئه‌وان كۆمه‌لى كن ته‌نها ئاره‌زووى ژيان ده‌كه‌ن بۆ ژيانى دونيا ئه ژين و رازين ،وه ئه‌وان له نيوان ئيماندار و بى باوه‌ران دان ، هه‌ر بۆيه خواى گه‌وره ده‌فه‌رموويت :﴿وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالْيَوْمِ الْآَخِرِ وَمَا هُمْ بِمُؤْمِنِينَ﴾.[82]

له ( عبدالله كورى عمر ) خوا لى رازى بيت – ده‌ليت : پيغه‌مبه‌رى خوا ﷺ فه‌رمووى : (( أَرْبَعٌ مَن كُنَّ فيه كانَ مُنَافِقًا خَالِصًا، ومَن كَانَتْ فيه خَصْلَةٌ منهنَّ كَانَتْ فيه خَصْلَةٌ مِنَ النِّفَاقِ حتَّى يَدَعَهَا : إذَا اؤْتُمِنَ خَانَ، وإذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وإذَا عَاهَدَ غَدَرَ، وإذَا خَاصَمَ فَجَرَ )).[83]

واته :چوار له سيفه تانه له( دوو رووه كانه به‌دل سۆزيى ) ئه گه‌ر ئه‌و خه‌سله تانه‌ى تيدا به‌دى كراو ئه‌وا له خه‌سله ته‌كانى( دوو روون ) ئه‌وا لى دوو ربكه‌ونه‌وه يان واز له‌م كرده وانه بينن تركى بكه‌ن كه ئه‌مانه : ئه‌گه‌ر ئه‌مانه‌تيكى گرته ده‌ست ئه‌وا نا پاكى لى ده‌كات ، ئه‌گه‌ر كرده‌وه‌يه كى كرد يان قسه‌ى كرد ئه‌وا به‌رده‌وام درۆ ده‌كات ، ئه‌گه‌ر په يمانى دا يان به‌لى دا ئه‌وا په يمان وبه‌لينه كه نا باته‌سه ر ئه‌وا غه‌در ده‌كات ، ئه‌گه‌ر مشتو مرو مجادله گفت و گۆ بكات ئه‌وا له سنور تى ده‌په‌ريت يان ده‌رده‌چيت ..!!

[81] - سورة البقرة (٨).
[82] - ابن القيم في مدارج السالكين (١/٣٤٩).
[83] - صحيح البخاري برقم (٣٤) و صحيح مسلم برقم (٥٨).

له ئیمامی (النووی ) له راڤەی ئەم فەرموودەیە دا دەڵێت: ئەم فەرموودەیە لە لایەن کۆمەڵێك لـە زانایـان بە کیشەی دەزانن یان جیاوازیان هەیە لەسەری ، چونکە هەریەك لەو خەسلـە تانـە یـا ئـەو سـیفاتەنە ئاراستەی موسلمانێك راست گۆش دەکریت ، کە هیچ شك و گومانی تیدا نیە ، بەلام زانایان بە کۆی دەنگ کۆکن لەسەر ئەوەی هەر کەسکێك بەدل زمان و کردەوە راست گۆ بێت ئەو خەسلە تانـەی تیـدا بیـت ئـەوا حوکمی بی باوەری لەسەر نادری ، یەکیك نابیت لە دوو رووە کان لە ناو دۆزە بمینیتەوە بۆ هەتا هـەتایی ،بەلام برا کانی (یوسف ) – علی السلام ) ئـە و خەسـلەتانەیان تیکـەلکرد ، هـەر بۆیـە هەنـدیك لـە پیشینەکان و زانایان ئەو هەندیکیان یان هەموویان ، ئەو فەرموودە هیچ کیشەو گرفت تیکی تیدانیە ،وە سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە ، بەلام زانایان جیاوازیان هەیە ، لە سەر ماناکـانی یـان واتاکـانی ئەو فەموودەیە ،بەلام ئەوەی زۆرینەی لیکۆلەرەوان ووتویانە ئەو باشترین و صحیح تریت هەلبژیردراوە ،

واتا: ئەو سیفەتانەلە خەسلەتەکانی دووروون ،وە خاوەنە کەی لە سیفە تانەدا وەك یان هاوشیوەی (دوو روو ) وایە ، وە بەو رەوەشتانە رەفتار دەکەن یان خۆیان دروست دەکەن ، چونکە کەسی (دوو روو ) نشاندان یان ئاشکرا بوونی رەفتەرە کانی یانکردەوە کانی جیاوازە لەوەی کە لە (دلْ) و دەروونی دایە ، چونکە ئەو مانایە بەدی دەکریت لە خاوەنی سیفە تەکان ،وە (دوو روو یەکەی ) ئەوەیەکە قسەیی کـرد درۆ دەکـات، یان کە پە یمان و بەلینی دا ،یان کە ئەمانەتیکی وەرگرت ، یان کە مشـتوو مـری مجادلـەی کـرد سـنوور دەبەزینی یان لە سنوور دەدەجیت ،یان لەگەل خەلك دا بەلین وپە یمان ناباتە سەر ، نـەخیر چـونکە دوو روو لە خۆی بەدەر دەخات لە ئیسلام دا ، بەلام لە (دلْ) دەروون و ناوە وەدا بـی بـاوەرە و کـافرە ، بـەلام پیغەمبەری خوا ﷺ پیغەمبەری خوا ﷺ وە لامی ئەوەی نە دایەوە کە (دوو رووە کـان ) وەك بـی بـاوەرە کان یان کافرەکان بەو سیفەتە (دوو روویـی ) بـۆ هەتاهـەتایی لـە خـواری خـورە وەی دۆزەخ دان ، وە پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (دوو روو ی بە دل سۆزیی ) واتای : چونکە بەهۆی ئـەو سـیفەتانەوە لـە هاوشیوەیە دوو رووە کان دەچیت ،وە ئەمەیە کە ئەو سیفەتانەبەسـەریاندا زال بـوون ، بـەلام سـەبارەت بەوەی کە دەگمەن ،ئەم سیفەتای یان ئەو ناوەیی لە ناو دانیە ، وە ئەوەش هەلبژاردنە لـە مانـایی ئـەم فەر موودە یە ..!! .[٨٤]

[٨٤] - شرح االنووي على مسلم (٢/٤٦-٤٧).

## ( ٢٨ )- دوا كەوتنی نویژە كانیان لە كاتی خۆی دا :

لە ( العلاءبن عبدالرحمن ) أنه قال: (( دخلنا على أنسٍ بنِ مالكٍ بعد الظهرِ فقام يصلّى العصرَ، فلما فرَغ من صلاتِهِ ذكرنا تعجيلَ الصلاهِ أو ذكرَها فقال: سمعتُ رسولَ اللهِ صلى الله عليه وسلم يقول: تلك صلاةُ المنافقين، تلك صلاةُ المنافقين: تلك صلاةُ المنافقين يجلسُ أحدُهم حتى إذا اصفرَّتِ الشمسُ فكانت بين قرنَيْ شيطانٍ أو على قرني الشيطانِ قام فنقرَ أربعًا لا يذكرُ اللهَ فيها إلا قليلاً )) .[٨٥]

واتە: لە ( علای كوری عبدالرحمن ) هاتووە كە دەلیت : لە دوای نویژی نیوەرۆ دا رۆویشتین ، بۆ لای ( ئەنسی كوری مالك ) لە یەكەم كاتی خۆی دا هەستا نویژی عەصری كرد ، كاتی كە لە نویژ بوویەوە ، ووتمان زوو نویژت كرد ،یان ( ئەنس ) باسی نویژ كردنی لە یەكەم كاتی خۆی دا بە بیر ئیمە هینایەوە و ووتی : گویم بیستی پیغەمبەری خوا ﷺ بووم كە سەبارەت بەدوا خەستنی نویژی عەصر بۆ كاتی نزیك بوونەوە لە رۆژ ئاوا بوون ، پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەوە نویژی دوو رووە كانە یان مونافیقەكانە ،ئەوە نویژی دوو رووە كان یان مونافیقە كانە ، یەكی لەوان دادەنیشی هە تا كاتی رۆژ زەرد دەبیت ،واتا نزیك بوونەوە لە رۆژ ئاوا بوون لە نیوان دوو شاخەكەی شەیتانەوە ،ئەو كاتە هە دەسی چوار دەنووك بەزەویدا دەدات واتە ئەوەندە بە پەلە نویژە كەی دەكات ، یادو زكری خوای گەورە تیدا ناكات مە گەر كە میك نەبیت ..!! 

لە( ابن القيم )- رەحمەتی خوا لی بیت – دەلیت : ( دوو رووەكان ) نویژە كانیان دوا دەخەن نویژە كان لە كاتی خۆیدا ئە نجام نادەن ، بەیانی لە كاتی رۆژ دا و ، وە نویژی عەصە لە كاتی رۆژ ئاوا بووندا، دە نووك بە زەویدا دەدەن وە ك قەلە رەش ، نویژە كانیان نویژی جستەو لاشەیە ، نەكنویژی ( دلّ ) بیت ، لە نویژە كانیاندا وەك ریوی بەدەوری خۆیاندا دەسوورینەوە یان لادەكەونەوە ، چونكە دلنیایە ئەو دەر كراوە وە دوا كراوە ، بەلی هەرگیز نویژ بەكۆمەل ناكەن بەلكو گەر یەكیكیان نویژی كرد یان لە مالەوە یان لە دووكان ئە نجامی دەدات ..!! .[٨٦]

---

[٨٥] - صحسح ابو داود برقم (٤١٣).
[٨٦] - ابن القيم مدارج السالكين (٣٥٤/١).

## ( ٢٩ )- ( دوور ووەكان ) دوا دە كەون لە نویژی بەكۆمەل :

عن ( عبد الله بن مسعود ) رضي الله عنه أنه كان يقول : (( من سرَّه أنْ يلقَى اللهَ عزَّ وجلَّ غداً مسلمًا ، فليحافظْ على هؤلاءِ الصلواتِ الخمسِ حيث ينادَى بهنَّ ، فإنَّ اللهَ عزَّ وجلَّ شرَعَ لنبيِّه صلَّى اللهُ عليه وسلم سُنَنَ الهدَى ، وإنهُ من سُننِ الهدَى ، وإني لا أحسبُ منكم أحداً ، إلَّا له مسجدٌ يصلّي فيه في بيتِه ، فلو صليتُم في بيوتِكم وتركتُمْ مساجدَكُم ، لتركتُمْ سنَّةَ نبيِّكم ، ولو تركتُمْ سنَّةَ نبيِّكُم لضللتُمْ ، وما من عبدٍ مسلمٍ يتوضأُ فيحسنُ الوضوءَ ، ثمَّ يمشي إلى صلاةٍ ، إلَّا كتب اللهُ عزَّ وجلَّ له بكلِّ خطوةٍ يخطوها حسنةً ، أو يرفعَ له بها درجةً ، أو يكفرَ عنه بها خطيئةً ، ولقد رأيتُنا نقاربُ بينَ الخُطا ، ولقد رأيتُنا وما يتخلفُ عنها إلَّا منافقٌ معلومٌ نفاقُه ، ولقد رأيتُ الرجلَ يهادَى بين الرجلينِ حتَّى يُقامَ في الصفِّ )) .[٨٧]

واتە : لە ( عبد الله كوری مسعود ) - خوا لی رازی بیت - دەی ووت : هەر كەسی حەزبكات سبەینی بگات بە خوای بەرزو مەزن بە موسلمانی با ئەو پینج نویژە بپاریزی كاتی بانگ دەدری بۆ بەجیهینانیان ، چونكە خوای گەورە ریگاكانی هیدایەتی بۆ پیغەمبەر ﷺ ئەو نویژانەش لە ریگاكانی هیدایە تن ،من نابینم یەكیك لە ئیوە ئیللا مەزگەوتیكی بۆ هەیە نویژی تیدا دەكات لە مالە كەیدا ، ئەگەر نویژە بكەن لە مالە كانتان دا و واز لە مەزگەوتە كانتان بهینن ..!! ئەو وازتان لە سووننەتی پیغەمبەركەتان ﷺ هیناوە ، ئەگەر وازتان لە سووننتەكەی پیغەمبەرەكەشتان ﷺ هیینا ئەوە گومرا دەبن ،وە هەر بەندەیەكی موسلمان دەست نویژە بگری بە دەستنویژەیكی باش و چاك دورست ، پاشان بروات بۆ نویژ ئیللا خوای گەورە چاكەیەكی بۆ دەنوو سیت بۆ هەر هەنگاویكی كە دەینی ، یان پلە یەك بەرزی دەكاتەوە ، یان دەیكاتە كە فارەت بۆ گوناهیكی ، بیگومان ئیمە هەنگاوە كا نمان لەیەكتر نزیك دەكردەوە ،هیچ كەسكیكیش دواناكەوی لە نویژی بە كۆمەل مە گەر كەسیكی ( مونافق یان دوو روو یەكی ئاشكرا بی ، بی گومان پیاوی وام بینیوە دوو كەس هاتوونە تە ژیر شانی تا هینراوەتە ریزی نویژی بە كۆمە ل ..!!

لە ( اشمنی ) – رەحمەتی خوای لی بیت – دەلیت : مەبەست لە دوو روو ئا ئەوەیە كە لە ( دلّ ) دەروونی بی باوەرە ، لە روالەت دا یان بەخۆنیشاندان ئیسلامە ..!! تەنها ئەوەیە كە نویژی بەكۆمەل واجبە فەرزە ، چونكە لە ( دلّ )و دەروون بی باوەر بووە كافر بوە پی ، چونكە كۆتا قەسەی یان ووشەی پیچەوانەی سەرەتایە كەیەتی ..!! [٨٨]

---

[٨٧] سنن النسائي برقم (٨٤٨) .
[٨٨] - اشمي في عون المعبود (٢/١٧٩).

## ( ٣٠ )- زمان دریژی یان زۆر بەلی  یان  زیدەرەوی کردن لە رەوانبیژی دا  :

**عن أبی أمامه ﷺ عن النبی ﷺ قال: (( الحیاء والعي شعبتان من الإیمان ،والبذاء والبیان شعبتان من النفاق )).[٨٩]**

**واتا : لە ابی امامە – خوا لی رازی بیت -  لە  پیغەمبەری خوا ﷺ  فەرموویەتی : شەرم و شکۆ  و بی دەنگی دوو بەشن لە باوەر ، زماندریژی و زۆر بەلی و زیدەرۆیی لەرەوانبیژیدا  دوو بەشن لە دوو روویی ..!!**

**عن ( الترمذي ) قال : ( والعي قلة الكرام ، والبذاء : هو فحش في الكلام ، البیان : هو كثرة الكلام مثل هؤلاء الخطباء الذین یخطبون فیوسعون في الكلام ویتفصحون فیه مدح الناس فیما لا یرضی الله ).[٩٠]**

**واته : لە ئیمامی ( ترمزی ) -رەحمەتی خوا لی بیت – دەلیت : شەرم كردن واتە : كەم ووتن لەدەر برینیدا ،لیدوانی خراپ  واته : فیزەوترین ووتە  لەدەربرین دا ، روانبیژیی واته : زۆر بەلی لە ووتن دا وەك ئەو كەسانەی كە لە ووتارە كانیاندا ، ووتارەكانیان رەوان و فەرەوان دەكەن بە  پیدا هەلدانی خەلك ، ئەو جۆرە ووتارانەش لە ووتاربیژی دا لە مەزگەوتەكاندا یان لە هەرشوینێك ئەوا لە لای خوای گەورە قبول و پەسەند نیە خوای گەورە لەم جۆرە كەسانە رازی نیە بەم شیوەیە ووتار بیژی بكەن ..!!**

**لە( ابن قیم ) دەلیت: كۆی باسەكە یان ئەوە یە كە لە نیو موسلمانانـدا وەك پیسی لە پارە یان مال و دارایی ،وە زۆربەی خەلكی بەرەو پیش دەبان بەهۆی نەبوونی تیروانی بۆ پارەو مال و دارایی ، چونكە ئەو پیگەی خۆی وەك مال یان دارایی و پارە  دەزانیت لە تیروانی خۆی  بۆ خەلك  ،وە كەمیك كن ئەوانە ،وە هیچ زیانیك لە ئاینەكاندانیە زیان بیت لە لیدانی خەلكدا ، بەلام لە پیشەوە دا ئاینەكان گەندە ل خرا پە كار دەبن ،ئەوەش كە خوای گەورە دەبارەی ئەمە لە قورئانی پیرۆز زۆر بەجوانی و بەروونی باسایان دەكات یان سیفەتەكانیان باس دەكات ، وە روونكردنەوەی بارودۆخەكانیان ،وە دووبارە كردنەو یاد كردنەوەیان ،زۆر بەتوندی بۆ بژیوی ژیان لەسەر نەتەوە كەیان  وە گەورەیی ئەو بەلایە لە نیوان پشتیان دایە ،وە پیویستی زۆر زیادە رەویان بەلیكۆلینەوە گومانە كان و لیكچوونیان وە گوی گرتن لی یان ، چەندە ریگای هیدایەتیان پچراندوە  بۆ ئەوانە بەرەوو ریگای خوای گەورە  دەرۆن ،وە ریگای تۆلە سەندنەوە یان گرتەبەر ،گەشە كردنی دوژمنە كەیان ، بەلام دوژمنەكەیان لە خۆ باویە ،وە گەشە كردنە كەش ئاخ نالەیە..!! .[٩١]**

---

[٨٩] - سنن الترمذي برقم (٢٠٢٧).
[٩٠] - نفص مصدر برقم (٢٠٢٧).
[٩١] -ابن القیم طریق الهجرتین (٦٠٣).

## ( ٣١ ) گوی گرتن لە گۆرانی و موسیقا :

لە( ابن القیم ) دەلیت : ( ئەوەیە بنچینەی دوو روویی ، چونکە پیچەوانەی نشاندانیان یان دەرخستنیان لە ( دلّ ) دەروونیان ناوەوەیان ، خاوەنی گۆرانی یان ئەو کەسەی گۆرانی پیژە لە نیوان دوو فەرمان دایە یان دوو شت دایە ،یا ئەوە تا بوختان دەکات و سنوور دەبەزینی ،یا ئەو تا زاهید یان راهب دەردەکەویت و ( دوو رووە ) ، ئەوە یە کە ئارەزووی نیشاندانی بۆ خوای گەورە بیت بۆ دوا رۆژ ، وە ( دلّ ) دە روونی پرلە ئارەزووی شهوات ، ئەو حەز بە شتانەدەکات کە خوا پیغەمبەرکەی رەق یان لییەتی ،لە دەنگە کانی ( المعازف ،وە کەل پەلی رابواردنی گۆرانی مۆسیقا وەك حەزو چیژ لی وەرگرتن بانگەشەی بکات و گۆرانی بلیت و هاوار بکات ، بەلام ( دلّ ) دەروونیکی مامور ری پیدراوە خۆشەویستی ئەوەیە کە خۆشەویستی خوا و پیغەمبەرە کەی ﷺ دەویت ، ئەو کردەوانەشی رق لی بیتەوە کە خوا و پیغەمبەرەکەی ﷺ رقیان لی یەتی ( ئەمە زەویەکی بایابانی دووروەە لە هیچ شتیك تیدا نیە ناروێت بەرهەمی هیچ نیە ئەم زەویە بیابانە هەربۆیە گۆرانی ووتن بۆ رابواردنی شهوات حەزو ئارەزوو هیچ بەرهەمیك بەخاوە نەکەی ناگەیەنی جگە لە نیفاق دوو رووی نەبیت ) وە هەروەها یەکیك لە نیشانەکانی ( دوو رووی ) ئەوەیە زۆر بە کەمی یادی خوای گەورە دەکات ،زۆر تەمبەلە بۆ هەستان لە نویژە کانی دا ، رخنە لە نویژ دە گریت ، وە بلی سەرسام بە گۆرانی تەنها ئەوە وسف کردنە کەیەتی ، هەروەها ئەوە یە ( دوو رووی ) دامەزرینەری درۆ کردنە ،وە گۆرانی زۆر لە شعر درۆ ترە ،چونکە شتە باشە کان قبیح و ناشرینە دەکات دەی رازی نیتەوە وە فەرمانی پیدەکات ،وە شتە قبیح وناشرینە کان باش و چاك دە کات دەست بەرداریان دەبیت ، وە ئەوە چاوی دوو روویە ، هەروەها دوو رووی ناپاکی فیل و تەلە کە مکرە، بەلام گۆرانی ووتن دامەزرینەری نفاق و دوو روویە ..!! .[٩٢]

---

[٩٢] - ابن القیم في إغاثة الهفان (١/٢٥٠).

## خۆپاراستن لە دوو ڕوویی

تا وەکو بەندەی موسلمان نفسی خۆی یان دەروونی خۆی بپاریزیت لە دوو ڕووی ریگری لی بکات ،بۆ ئەوەش زۆر پیویستە سیفەتی باش و کردەوەی چا کە هەبیت ، ئەویش ئەمانەن :

(١)- گەورەیی (اللهاكبر ) لە نویژ دا یان تکبیر کردن لە نویژدا یان لە ئەحرام بەستان دا :

عن (أنس بن مالك ) رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ : ((مَن صلَّى أربعينَ يومًا في جَماعةٍ، يُدرِكُ التَّكبيرةَ الأولَى" كُتِبَ له بَراءتانِ: بَراءةٌ مِن النَّارِ، وبَراءةٌ من النِّفاقِ)).[٩٣]

واتە: لە ئەنسی کوری مالك – خوا لی رازی بیت – دەلیت : پیغەمبەری خـوا ﷺ (الله أكبر ) ی یەکەمی پیشنویژدا واتە نویژە کانی بە کۆمەل بکات ئەوە دوو رزگار بوونی بۆ دە نووسریت ، رزگار بوون لە ئاگری دۆزەخ ،وە رزگار بوون لە (دوو ڕوویی )..!!

رزگار بوون لە ئاگر دا واتە : تەواو بوون یان رزگار بوون لە ئاگر ،دەلی :رزگار بوون لە دونیا دا لە عیب و عار ی دوو ڕووی یان زرگار بوون لە دوو ڕووی ،( الطيبي )دەلیت : پاریزراو بیت لـە دونیـادا لـە کـارو کردەوەی دووڕووی ، وە یارمەتی دا یان موفەقی بکا بە کردەوەی ئەهلی دلسۆزو راسـت گۆیانـە ،وە لـە دوا رۆژیش دا پاریزراو بیت لە سزا و ئازاری دوو ڕووی وە شاهید بیت بەوەی کە ئەو کەسە دوو روو نەبووە ،واتا ئەگەر دوو ڕووەکان هەستان بۆ نویژ کردن وە بە تەمەلی هەسـتانەوە بـۆ نویـژ ،وە بـارو دۆخـی ئەوانـە جیاوازە بە هەما شیوە لە چاودیری دایە ..!!.[٩٤]

---

[٩٣] - سنن الترمذي برقم (٢٤١).
[٩٤] - تحفة الأحوذي (٤٠/٢).

## ( ٢ )-ڕەوشت بەرزی ئاكاری جوان وە زانین لە ئاین یان زانستی شەرحی :

**عن أبي هريرة ﵁ قال : قال رسول ﷺ (( خصلتانِ لا تجتمعانِ في منافقٍ : حسنُ سمتٍ، ولا فقهٌ في الدينِ )).[٩٥]**

**واتە : ابی هریرە – خوا لی رازی بیت – دەلیت : پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەم دوو شتە لە دوو روو دا كۆنابیتەوە ، ڕەوشت بەرزی و ئاكاری جوان ، وە حالی بوون لە ئاین یان زانین لە زانستی شەرحی ..!!**

**( ئاكاری جوان ) واتە : گەران بەدوای ریگای خیر وچاكە دا یان جلی خۆت یان خۆت بگۆری بە كردەوەی چاكەو چاكەكاری دا ،وە خۆت دا مالینی لە هەموو كردەوەی عیب وعار وشەرمەزاری ،لە روالەت و دا لە دل دەروونەوە ..!! ( نەزانین لەئاین ) هاسۆزی بی چونكە ( ئاكاری جوان ) لە ریرەوەی نەفی كردنە بەلام دلنیانیە لەریرەوی نهی كردن ..!!.[٩٦]**

---

[٩٥] - سنن الترمذي برقم (٢٦٨٤).
[٩٦] - تحفة الأحوذي (٣٧٨/٧).

## ( ٣ ) بەخشین ( صدقه ) :

عن ابی مالك الاشعری ﷺ قا : قال رسول الله ﷺ :(( الطُّهُورُ شَطْرُ الإيمانِ، والْحَمْدُ لِلَّه تَمْلأُ الميزانَ، وسُبْحانَ اللهِ والْحَمْدُ للَّه تَمْلآنِ -أَوْ تَمْلأُ- ما بيْنَ السَّمَواتِ والأرْضِ، والصَّلاةُ نُورٌ، والصَّدَقةُ بُرْهانٌ، والصَّبْرُ ضِياءٌ، والْقُرْآنُ حُجَّةٌ لَكَ، أوْ عَلَيْكَ، كُلُّ النَّاسِ يَغْدُو فَبايِعٌ نَفْسَهُ فَمُعْتِقُها، أوْ مُوبِقُها )).[٩٧]

واتە : لە ابی مالك ئەشعری – خوا لی رازی بیت – دە لیت : پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : پاك وخاوینی بەشیكە لە ئیمان ، ( الحمد الله ) تەرازوو یان میزانی چاكە پردە كات ،وە ( سبحان الله والحمد الله ) نیوان ئاسمانە كان و زەوی پردە كات لەچاكە وخیر ،وە نویژ كردن نورە یان رووناكی یە ، خیرو صدقە راستی ئیمانە و گویی رایە لی بۆ خوا سەلماندنە، ئارامگرتن رووناكی درەوشاوەیە ،قورئانیش بەلگەیە بۆت یان لە سەرت ،خەلكی هەموویان بەیانیان زوو دەرۆن خۆ دەفرۆشن ،بەوەش یان خۆی رزگار دەكات ،یان خۆی لە ناو دەبات ،واتە یان خۆی بە خوای گەورە دەفرۆشیت و فەرمانە كانی جی بەجی دەكات و خۆی رزگار دەكات ،وە یان خۆ بە شەیتان دەفرۆشیت فەرمانەكانی جی بەجی دەكات خۆی لە ناو دەبات..!!

چونكە خیرو صدەقە بەلگەیە لە سەر ئیمانی لە سەرمان ،ئەوەیە كە دوو روو ریگری لە دەكات چونكە باوەری پی نیە بە خیرو صدقە ،وە دەرهینانی خیر و صدەقە لە سەر خیرو صدەقەی ئیمانەویە ..!!.[٩٨]

[٩٧] صحيح مسلم برقم (٢٢٣).
[٩٨] - شرح النووي علي مسلم (٣/١٠١).

## (٤)- شەو نویژ كردن :

**لە (قتادە) وە دەلیت: بە دەگمەن لە شەو دا هەلدەسن (دوو رووەكان ).**[٩٩]

**ئەوەش لەبەر هۆی ئەوەیە كە (دوو روو ) چالاكیەك یان كردەوەیەكی چاكە دەكات ،ئەگەر خەلك بینیان ئەو بەتال دەبیتەوە ،ئەوە نەبووە پالینەر بـۆ كاریـك یـان چاكەیەك.**

**بەلام كاتیك بەندە هەستاو شەو نویژی كرد ئەوا بەلگەیە بۆ ئەوەی كە ریگری لـە دوو روویە كەی بكات ،وە لەسەر خیرو چاكەیە بۆ ئیمانەكەی ..!!**

---

[٩٩] - حلية الأولياء (٢/٣٣٨).

## ( ٥ )- جیهادو تی كۆشان له پیناوی خوا دا :

**عن ابي هريرة ﵁ قال : قال رسو ل الله ﷺ : (( مَن ماتَ ولَمْ يَغْزُ، ولَمْ يُحَدِّثْ به نَفْسَهُ، ماتَ علَى شُعْبَةٍ مِن نِفاقٍ )).[١٠٠]**

واته : له ابی هریره –خوا لی رازی بیت – دەلیت : پیغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :

هەركەسیك بمریت غەزاو جەنگ جیهادی لەریگەی خوا دا نەكردبیت و به ( دڵ )یش نەهاتبیت جیهاد و غەزا بكات ،ئەوا له سەر بەشیك یان شعبەی نفاق یان دوو رووی مردووە ..!!

له ( النووی ) ده لیت : مەبەست لەم كارە ئەوە یە تەنها وەك دوو رووە كانە كە دوا دەكەوتن له جیهادو تی كۆشان له پیناوی خوا دا ئەوە وسفی باسە كە لەسەر ئەوانە بەم شیوەیە وسفیان دەكات، ئەگەر واز یان تركی جیهاد و تی كۆشان بكەین ئەوا یەكیكە به بەشە كانی دوو روویی یان نفاق ،وە ئەم فەرموودەیە ئەمە مەبەسەتە كەیەتی كە بەندە بمریت پیش ئەوەی كارا بیت ئاراستەی لۆمە كردن ناكریت ، وە ئاراستەناكریت لەسەر مردن وە مەبەستیش ئەوە نەبووە ..!! .[١٠١]

---

[١٠٠]- صحيح مسلم برقم (١٩١٠).
[١٠١] - شرح النووي على مسلم (٥٦/١٣).

## ( ٦ ) – یادی خوا زۆر کردن :

له ( ابن القیم ) – ڕەحمەتی خوای لی بیت – دەڵیت : زۆر یادی خـوا کـردن ،سـەلامەتیه لـه ( دوو ڕووی ) یان نفاق ، چونکه ( دوو ڕووه کان ) زۆر یادی خوای گەورە دەکەن ..!! خوای گەورە دەفەرموویت : له سەر دوو ڕووه کان ﴿وَلَا يَذْكُرُونَ اللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا﴾.[١٠٢] وه ( کعـب ) دەڵیـت : زۆر یادی خوا کردن ڕزگارت دە کات له ( دوو ڕوویی ) وه مـۆری خـوای گـەورە لەسـەر دوو ڕووه کانەله سورەتی المنافقین که دەفەرموویت : ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُلْهِكُمْ أَمْوَالُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ﴾.[١٠٣]

لەم ئایه تەدا ئاگاداری ئیمانداران دەکاتەوە له ئاشووبی یان فتنەی دوو ڕووه کـان ،چـونکه ئەوانه بی ئاگان له یادو زکری خوای بەرز بالادەست ، ئەم لەسەر( دوو ڕووه کانه ) .

و پرسیاریان له هاوەلان کرد دەربارەی ( الخوارج ) ئایا ئەوانه دوو ڕوون ..؟!ووتیان : نەخیر ، دوو ڕووەکان یادی خوا زۆر کەم دەکەن ..!! ئەوش له نیشانەکانی دوو ڕووه کانه ، وه کـەمی یادی خوای گەورە ، ئەوه یه که سەلامەت نابی له دوو ڕوویی ، وه خوای گەورە پەخشندە ترە لەوەی که بۆ ئازاردانی دلیك که دوو ڕووی تیدا یه ، ئەوەیه که دله کانیـان بـی ئاگایـه لـه زکرو یادی خوای گەورە ..!!.[١٠٤]

---

[١٠٢] -سورة النساء (١٤٢).
[١٠٣] - سورة المنافقون (٩).
[١٠٤] الوابل الصیب (١١٠).

## ( ٧ )- دوعاء و نزاو پارانەوە لەخوای گەورە :

لە( جبیر کوری نفیر ) دەلیت: چوومە مالی ابو الدرداء لە وەلاتی شام لە شاری حمص ، ئەو لە لە پیوە بوو لە نویژ دا لە ناو مەزگەوت ، کاتی دانیشت شاهیدمانی هینا و دەستی کرد بە دوعا کردن و پە ناگرتن بە خوا لە ( دوو روویی ) ، کاتیك ئە نجامی دا تەواو بوو ، پیم ووت : خوای گەورە لیت خۆش بیت ئەی ( ابو الدرداء ) ، چیە ئایا تۆ دوو رووی ، ووتی : خوایە لیمان خۆش بە -سی جار ئەمەی دوو بارە کردەوە – لەو بەلاو ئاشووبە ..؟! ووتی: بە خوا ئەگەر پیاویك تووشی فتنەو ئاشووبیت لەسەعاتیك دا وەر دەگەریت لە ئاینە کەی ..!! .[105]

---

[105] - سيرة أعلام النبلاء (٣٨٢/٦) .

## ( ٨ )-خۆشەویستی بۆ ئەنصارەکان :

**عن انس بن مالك ﷺ قال : قال رسول الله ﷺ : (( آيَـةُ الإيمـانِ حُـبُّ الأنْصارِ، وآيَةُ النِّفاقِ بُغْضُ الأنْصارِ )).**[١٠٦]

واته : له ئەنسی کوری مالك – خوا لی رازی بیت – دەلیت : پیغەمبەری خوا ﷺ فـەرمووی : نیشانەی باوەر یان ئیمان ،خۆشەویستی ئەنصارەکانە ، وە نیشانەی دوو روو بغـزو قینـه و رەق لی بوونەوەیە له ئەنصارە کان ..!!

## ( ٩ ) – خۆشەویستی بۆ ( علی کوری ابی طالب ):

**عـن زر بـن حبـيش ﷺ قـال : قـال ( علـي بـن ابـي طالـب ) ﷺ : قـال رسـول الله ﷺ : (( والذي فَلَقَ الحَبَّةَ، وبَرَأَ النَّسَمَةَ، إنَّه لَعَهْدُ النبيِّ الأُمِّـيِّ صَـلَّى اللَّـهُ عليـه وسلَّمَ إلَـيَّ: أنْ لا يُحِبَّنِي إلَّا مُؤْمِنٌ، ولا يُبْغِضَنِي إلَّا مُنافِقٌ )) .**[١٠٧]

واته : له زر کوری حبیش - خوا لی رازی بیت دەلیت : له علی کوری ابی تـالیب – خوالی رازی بیت- دەلیت : پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : سویند بەوەی تۆی دەرهیناوە یان تۆی تەقاندووە ،گیانی کـردووە بـەر هەمووگیان لەبەریك دا ،ئەوە پەیمانی پیغەمبەری خوا ﷺ کە نەخویندەوارە بۆ من : کەس منی خـۆش ناویت ئیماندار نەبیت ،کەسیش رق وقینەی لیم نیە دوو روو نەبیت ..!!

---

[١٠٦] - صحيح البخاري برقم(٣٧٨٤).
[١٠٧] - صحيح مسلم برقم (٧٨).

پویستە لە گەل دوو رووە کان هەلسو کەوت نەکەیت ،وە نابیت بە کەم سەیر بکرین چونەکە زۆر ترسناکن ،هەروەها دوو رووە کانی ئەم سەردەمە زۆر ترسناك و کاریگەرن لەسەر کۆمەلگای ئیسلامی لە رۆژگارە دا ،لە چاوی دوو رووە کانی سەردەمی پیغەمبەری خوا ﷺ .

لە ( حذيفة بن يمان ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : (( إنَّ المُنَافقِينَ اليومَ شَرٌّ منهمْ علَى عَهْدِ النبيِّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ" كَانُوا يَومَئذٍ يُسِرُّونَ، واليومَ يَجْهَرُونَ )).[١٠٨]

واتا : لەم رۆژە دا دوو رووە کان زۆر خراپتر و شەرانگیز ترن یان ناپاك ترن لە سەردمی پیغە مبەری خوا ﷺ دا ، لەو رۆژە دا ئەوان بی دەنگ بوون ،بەلام لە ئیستادا ئەوان دەنگیان بەرزە بە ئاشکرا دەنگ بەرز دەکەنەوە ..!!

[١٠٨] - صحيح البخاري برقم (٧١١٣).

## ئەمانە خالە كانی هەلویستی موسلمانان دەربارەی دوو رووەكان :

### (١) نابیت شوینی فەرمانەكانی دوو رووە كان بین :

**قال الله تعالی :** ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ اتَّقِ اللَّهَ وَلَا تُطِعِ الْكَافِرِينَ وَالْمُنَافِقِينَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾.[109]

واتا : ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ لە خوا بترسە و بەردەوام بەلە سەر تقواو پاریزكاری ، هەرگیز ملكەچی بی باوەران و دوو رووە كان مەبە ، كە دە یانەویت لە ریگای راست دوو رت بخەن یان ویلت بكەن ، چونكە بەراستی خوا هەمیشە و بەردەوام زاناو دانایە ..!!

لە ( طبري ) – رحمە تي خوای لی بیت – دەلیت : خوای گەورە بە پیغەمبەرە كەی ﷺ دەفەرمووی : ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ اتَّقِ اللَّهَ﴾ اطاعة یان فەرمان بەرداری و شوینكەوتن ،ئەدا ئیكی فەروز واجب و مافە لە سەر تۆ ، وە كۆتایی بە حەرام كراوە كان بینە ،وە سەر پیچی سنوورە كان مەكە ، ﴿وَلَا تُطِعِ الْكَافِرِينَ﴾ ئەوانە بە تۆ دەلین : ئەوانە دەیانەویت لە ناو شوینكەوتووە لاوازە فەقیرە كان دەربكە كە لە لای تۆ دا دەنیشتوون ، ئەوانە ئیمانیان ئاشكراو دەكەن كە باوەریان بەخوای گەورە هەیە ،وە ئامۆژگاریت دەكەن ، بەلام ئەوانە بەهیچ شیوەیەك مەیلو مەرامیان بۆ تۆ و بۆ هاوەلە كان ، وە دەیانەویت ئاینەكە تیاچیت ،هیچ بیرو بۆ چوونیكیان لی قبول مەكە ..!! وە راویژیان پی مەكە ،وە داوای ئامۆژگاریان لی مەكە ، چونكە ئەوان دوژمنی تۆن ..!! ﴿إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ دەفەرمووی : خوای گەورە خاوەنی زانست زانیاریە بە هەموو نفسیك ویژدانیك دل دەروونیك دا ،مەبەستیان لە ئامۆژكاری ئەوەیە كە خۆ بەدریا بخەن نیشان بدەن كە چاكە كارن ، لەگەل ئەوكەسانەی كە تۆ تیدا بەشدارن ،دانایی لە بەریوە بردنی فەرمانەكان بەسەر تۆ دا، وە فەرمان بەسەر هاولە كان وە فەرمان ئاینە كەت دا ، وە جگە لەوەی دانایی لە هەموو دەرست كراوە كاندا ..!!.[110]

---

[109] - سورة الاحزاب (١)

[110] - طبراني في تفسير جامع البيان(٢٠/٢٠٢) .

## ( ٢ ) سەر زەنتشیان بكە و بۆئەوەی بانگە شەی بۆ دەكەن :

**قال الله تعالى :** ﴿بَشِّرِ الْمُنَافِقِينَ بِأَنَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا﴾.[١١١]

**واتا :ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مژدە بەدە بە دوو رووە كان كە بەراستی سزایەكی بەئێشیان بۆ ئامادە كراوە ..!!**

**قال الله تعالى :** ﴿أُولَئِكَ الَّذِينَ يَعْلَمُ اللَّهُ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَعِظْهُمْ وَقُلْ لَهُمْ فِي أَنْفُسِهِمْ قَوْلًا بَلِيغًا﴾.[١١٢] **واتا : ئا كەوانەكەسانێكن خوا دەزانێت چی لە ( دڵ ) و دەروونیاندا حەشاردراوە ،كەوتە رەفتاری ئەوانە پشتگوی بخە ، ئامۆژگاریانبكە و قسەی بە پێزو بەتوێكلی وایان پێ بلێ كە بەقولایی دەروونیاندا بچێت خوارەوە و بیان هەژێنێت ..!! لە ( طبري ) – رحمە تي خوای لی بیت – دەڵێت : سوپاسو ستایش بۆ خوای گەورە دەفەرمووی : ﴿أُولَئِكَ﴾ واتە : ئەو كەسانە دوو رووە كانن بەو وەسفكردنە یان ، ئەی محمد ﷺ ﴿يَعْلَمُ اللَّهُ مَا فِي قُلُوبِهِمْ﴾ ئەوانە دەیانەوی لە سنوور دەر چو ویان ( طاغوت ) بێن دادوەریان بكەن یان بانگەوازی لە سنور دەرچوان بكەن ..!! نا یانەوێت تۆ دادوەریان بكەیت ..!! كەچی دوو رووە كان پشتت تی دەكەن رووت لی وەردەگێرن بە تەواوی ..!! دوو رووەكان لە سنورو دەچونن یان لایان داوە ..!! وە ئەگەر سویند بەخواش بخۆن ئەوا چاك و خێریان ناوێت .. ﴿فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَعِظْهُمْ﴾ كەواتە ئەوانە بە جستەو لاشەیان و بدەنیان سزا مەدە ، چونكە بانگیان بكە بیان ترسێنە بلێ خوای گەورە چارە سەرو دادوەریتان دەكات و سزاتان دەدات لە مالە كانتان دا ، وە ئاگاداریان بكەوە لە و فێل تەكەیی كە هەیتیان لە سەر فەرمانەكانی خوای گەورە و وەفەرمانەكانی پێغەمبەرەكەی ﷺ ..!! ﴿وَقُلْ لَهُمْ فِي أَنْفُسِهِمْ قَوْلًا بَلِيغًا﴾ وە قەسەی بە پێزو بە توێكلی وایان پێ بلێ كە بەقوولایی دەروونیاندا بچێتەخوارەوە بیانهەژێنێت ( بریندااریان ) بكات ، یان لە خوا بترسن ، وە راست و دروستی پەیامەكەی پێغەمبەرەكەی ﷺ هەروەها خوای گەورە خاوەن پەیمان و بەڵێنە ..!!**[١١٣]

---

[١١١] - سورة النساء (١٣٨).
[١١٢] سورة النساء (٦٣).
[١١٣] - طبري في تفسير جامع البيان (٥١٥/٨).

## (٣) نەكردنی مشت و مرو ( مجادله ) ، وە پالپشتی نە كردنیان :

قال الله تعالى: ﴿وَلَا تُجَادِلْ عَنِ الَّذِينَ يَخْتَانُونَ أَنْفُسَهُمْ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ مَنْ كَانَ خَوَّانًا أَثِيمًا﴾.[١١٤]

واتا: بەرگری لەو كەسانەش مەكە كە نپاك و خیانەت لە خۆیان دەكەن ، چونكە بەراستی خوا ئەو كەسانەی خۆش ناویت هەمیشە خیانەتكارو تاوانبارن ..!!

لە ( طبري ) – رەحمەتی خوای لی بیت – دەلیت : سوپاس وستایش بۆ خوا دەفەرمووی : ﴿وَلَا تُجَادِلْ﴾ ئەی ﷺ مشت ومرو گفت و گۆ مە كە لە گەل ئەوانە ﴿عَنِ الَّذِينَ يَخْتَانُونَ أَنْفُسَهُمْ﴾ واتا : خیانەت كارو ناپاك ن لە گەل نفسی خۆیان ، چونكە ئەوانە لە خیانەكاران ،وە خیانەتان لیدەكەن ، وە خیانەت لە مال و دارایی خۆیان دەكەن وە ئەوانە لە نەوەی ( ئەبیرق ) كە ( نەوەیەكی عەرب بوون لە سەردەمی جاهیلی و ئیسلام ) دزو تاوانكاور دوو روو بوون ) هەروەها دەفەروویت : مشت ومرو گفت و گۆ مەكەن لە سەر ماف و داوا كانیان ، چونكە ئەوانە خیانەت لە مال و دارایی دا دەكەن ..!! ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ مَنْ كَانَ خَوَّانًا أَثِيمًا﴾ چونكە خوای گەورە ئەو كە سانەی خۆش ناویت كە سیفەتی خیانەت ناپاكیان تیدایە كە ناپاكی لە گەل خەلك دە كەن لە مال دارایی دا ، وە لەسەر گوناهو تاوان دە رۆن ،ئەو گوناهانەی كە خوای گەورە حرامی كردوونە ..!! .[١١٥]

---

١١٤ - سورة النساء (١٠٧).
١١٥ - طبري في تفسير جامع البيان (٩/١٩٠).

## (٤) پشت نەبەستن پیان وە یان دل سۆزیان بۆ دەر نەبرین :

**قال الله تعالى :** ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا بِطَانَةً مِنْ دُونِكُمْ لَا يَأْلُونَكُمْ خَبَالًا وَدُّوا مَا عَنِتُّمْ قَدْ بَدَتِ الْبَغْضَاءُ مِنْ أَفْوَاهِهِمْ وَمَا تُخْفِي صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ الْآيَاتِ إِنْ كُنْتُمْ تَعْقِلُونَ﴾.[١١٦]

**واتا : ئەی ئەوانەی باوەرتان هیناوە ،بە کەسانیکی تر جگە لە خۆتان متمانە مەکەن و نهینی خۆتان لا یان مە درکینن ، چونکە ئەوان کۆلنادەن لە دروست کردنی تەنگانەو گیروگرفت و ناخۆشی بۆتان ، ئاواتیان ئەوەیە دووچاری ئازارو کیشە بن ، بە ئاشکرا رق و کینە لەدەم و دەروونیان دا دیارە ، ئەوەی لە سینەیان دا شاردوویانەتەوە زۆر گەورە ترە لەوەی کە دەری دەخەن ،بی گومان ئیمە نیشانەو بەلگەمان بۆ دیاری کردوون تا دۆست لە دووژمن جیا بکەینەوە ئەگەر عەقل و ژیریتان بەخەنە کار ..!!**

**لە ( طبري ) – رحمە تي خواي لي بيت - دەلیت : ئەم ئایەتە دابەزیوە بۆ ئومەتی موسلمانان، کە تیکە لاوی ئەو هاو پە یمانانە نەبن ، کە وە ک جوو لە کە کان و خەلکانی دوو روو ، بە هۆی ئەم هۆکارانەوە کە لەسەردەمی نەفامی دا پیش ئیسلام ، چونکە خوای گەورە ئامۆژگاری کردووین لەو فەرمانانەی کە لەم ئایە تە دا دای بەزاندووە ..!! .[١١٧]**

[١١٦] - سورة ال عمران (١١٨).
[١١٧] طبري في تفسير جامع البيان (١٤٠/٧).

## (٥) زلیلیان بکەن ،ریزیان نەگرن و پالپشتیان نەکەن :

**عن بریده – خوا لی رازی بیت – دەلیت : پیغەمبەری خوا ﷺ فـەرمووی :**
**(( لا تَقولـوا للمنـافقِ سیدٌ ، فإنـهُ إنْ یـكُ سیداً فقـدْ أسـخطتُم ربَّكُمْ عـزَّ وجلَّ )).** [118]

**واتە : لە بریدە – خوا لی رازی بیت –دەلیت : پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : بە کەسـانی دوو روو مەلی : ئاغا یان سید یان بە ناوی ریزەوە بانگیان بکەن ، چـونکە ئیـوە ئـەوان بـە ئاغا وە سید ، یان ریزیان لی بگرن ئەوا خوای گەورە لە خۆتـان دەرە نجینن یان تـوورە دەکەن ..!!**

[118] سنن ابي داود برقم (٤٩٧٧).

## ( ٦ ) نویژ نەکردن لەسەر تەرمەکانیان :

**قال الله تعالى :** ﴿وَلَا تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِنْهُمْ مَاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَى قَبْرِهِ إِنَّهُمْ كَفَرُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَمَاتُوا وَهُمْ فَاسِقُونَ﴾.[119]

**واتا : هیچ کاتیك لە سەر هیچ لەو دوو رووانە نویژ نەکەی کە مرد، لەسەر گۆڕەکەشی مەوە ستن ، چونکە بەراستی ئەوانە باوەڕیان بە خواو بە پیغەمبەرەکەی نەبووە ،کاتیکیش مردن ئەوا نە لە ئاین دەرچوون گەندەل کارو خراپە کار بوون ..!!**

**عن ( عبدالله بن عمر ) رضي الله عنه قال :** (( لَمَّا تُوُفِّيَ عبدُ اللَّهِ بنُ أُبَيٍّ، جاءَ ابنُهُ إلى رَسولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ فَقالَ: يا رَسولَ اللَّهِ، أعْطِنِي قَمِيصَكَ أُكَفِّنْهُ فيه وصَلِّ عليه، واسْتَغْفِرْ له. فأعْطَاهُ قَمِيصَهُ، وقالَ: إذَا فَرَغْتَ منه فَآذِنَّا فَلَمَّا فَرَغَ آذَنَهُ به، فَجَاءَ لِيُصَلِّيَ عليه، فَجَذَبَهُ عُمَرُ فَقالَ: أليسَ قدْ نَهَاكَ اللَّهُ أنْ تُصَلِّيَ علَى المُنَافِقِينَ، فَقالَ: {اسْتَغْفِرْ لهمْ أوْ لا تَسْتَغْفِرْ لهمْ إنْ تَسْتَغْفِرْ لهمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لهمْ} ﴿التوبة: ٨٠﴾ فَنَزَلَتْ: {وَلَا تُصَلِّ علَى أحَدٍ منهمْ مَاتَ أبَدًا ولَا تَقُمْ علَى قَبْرِهِ} ﴿التوبة: ٨٤﴾ فَتَرَكَ الصَّلَاةَ عليهم )).[120]

---

[119] سورة التوبة (٨٤).

[120] - صحيح البخاري برقم (٥٧٩٦).

واتا :له( عبدالله كوری عمر ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : كـاتی ( عبـدالله كـوری ئوبـەی كوری سەلول ) مرد ( یەكیك بوو لە دوو رووە كانی سەر دەمی پیغەمبـەری خـوا ﷺ ) ئـەوە بوو كورەكەی ( عبدالله كوری ئوبەی كوری سـەلول ) هاتـە خزمـەتی پیغەمبـەری خـوا ﷺ رۆیشت دا وای لیكرد كراسەكەی خـۆی بـداتی تـاكو ( بـاوكی ) بـە و كراسـە كفـن بكـات ، پیغەمبەری خوا هەلسا نویژی لە سەر بكات ، ( عمری كـور خـەتاب ) هەلسـاو كراسـەكەی پیغەمبەری خوای ﷺ گرت و ووتی : ئەی پیغەمبەی خوا ﷺ ئایا نویژی لەسـەر دەكـەی ..؟! كاتی پەروەردگاری لی قەدەغە كردووین نویژی لەسەری بكـەین ..؟! پیغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمووی : بی گومان خوای گەورە منی سەرپشك كردووە فەرموویـەتی :﴿ اسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لَا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِنْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لَهُمْ﴾.[١٢١] واتـا : داوای لی خۆش بوونیان بـۆ داوا بكەیت یان نەیكەیت هیچ سوودیی نیە ئەگەر حەفتا جاریش داوای لی خۆش بوونیان بـۆ بكەی ، خوا هەر گیز لیتان خۆش نابی ، من زیاتر لە حەفتا جار داوای لی خۆشبوونی بـۆ دە كەم ..!! ( عمر كوری خەتاب ) ووتی : ئەمە دوو رووە ئەلی : نویژی لە سەر كرد ..!! خـوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە كە دەفەرمووی : ﴿وَلَا تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِنْهُمْ مَاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَى قَبْرِهِ إِنَّهُمْ كَفَرُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَمَاتُوا وَهُمْ فَاسِقُونَ﴾..!! ئیتر لەدوای ئەم ئایەتەە پیغەمبـەری خوا نویژی لەسەر دوو رووە كان نەكرد ..!!

---

[١٢١] - سورة التوبة (٨٠).

## سەر باسە کان